# پایزە برا

## چەند سەرگوزشتەیەکی ڕاستەقینەیە

بەرگی یەکەم







مەلا ئەحمەدی شەریعە



ناوی کتێب: پایزەبرا ـ بەرگی یەکەم

ئامادەکار: مەلا ئەحمەدی شەریعە

دیزاین: ڕەوشت محەمەد

چاپ: چاپی یەکەم

چاپخانە: چاپخانەی ڕێ نوێ

تیراژ: ١٠٠٠ دانە

# به ناوی خوا

سوپاس و ستایشی بێپایان بۆ پەروەردگاری جیهانیان، درووود و سەلام لەسەر گیانی تەواوی پێغەمبەران، بەتایبەتی پێغەمبەری کۆتا زەمان و یار و یاوەران و شوێنکەوتووان.

چیرۆك و بەسەرهات و داستان و سەرگوزشتە و نموونەهێنانەوە، بە درێژایی مێژوو کاریگەریی گەورەیان هەبووە لەسەر چاکسازیی دەروونیی و گیانیی، لەسەر تاك و کۆمەڵگە، بە پەندوەرگرتن لە ئەزموون و بەسەرهات.

تەنانەت هەڵەی پاڵەوانی ئەو چیرۆك و داستانانە کەسانی زانا و دانا و سیاسەتمەدار بۆ دانانی پرۆژە و بەرنامە و پلانی داهاتوویان زۆر سوودیان لە ئەزموون و داستان و چیرۆك و نموونەی رابردووان بینیوە، عەرەب دەڵێن: اللبيبُ مَنِ اتعظَ بِغيره، واتە: "ژیر ئە و کەسەیە پەند لە کەسانی دیکە وەردەگرێت".

لە تەواوی پەڕاوە ئاسمانییەکانیشدا زۆر گرنگیی بەم لایەنە دراوە، بە تایبەتیش قورئانی پیرۆز و فەرمایشتە پیرۆزەکانی پێغەمبەر (سەلامی خوای لەسەر بێت) کە بە دەیان و سەدان چیرۆك و بەسەرهات و داستان و نموونەیان لەخۆ گرتووە، لەگەڵ تەواوبوونی هەندێکیشیاندا، خوا فەرمویەتی: إنّ في ذلك لَعبرة لأولي الألباب، واتە: بە ڕاستی لەم بەسەرهات و داستانەدا پەند و ئامۆژگاریی هەیە بۆ ژیر و عە قڵمەندەکان، یان دەفەرموێت: إنّ في ذلك لعبرة لأولي الأبصار، واتە: بێگومان لەم بەسەرهات و چیرۆك و داستانانەدا پەند و ئامۆژگاریی هەیە بۆ کەسانێك کە ڕاستیی دەبینن و زەین ڕوون و بەرچاو ڕۆشنن.

جونەید ڕەحمەتی خوای لێبێت فەرموویەتی: "نموونە هێنانەوە دەوری موجاهید دەبینێت لە بڵاوکردنەوەی ئیسلامدا". بە تایبەت لەم ڕۆژگارەدا کە تای تەرازووی ماددیی لە ژیانی ئادەمیزادەکاندا قورسە و لە زەوی گیر بووە و هەموو جموجوڵێکی ژیان پێشبڕکێیە لەسەر لایەنی ماددیی و کۆکردنەوەی دونیا، تای تەرازووی گیانیی و دەروونیی، یان بڵێین ڕۆحیی و مە عریفیی و ئیمانیی لە لای زۆربەی هەرە زۆرمان زۆر سووکە و دەبێت لە بەرزیی بۆی بڕوانین، فرمێسك ڕشتن لە پێناوی خوادا لە خوێنڕشتن کاریگەرترە، ئەو چاوەی فرمێسکی لەبەر خوا داباراند بێت دووکەڵی دۆزەخی تێناچێت.

دەی بەڕێزیشت بەشدارییمان بکە بە ڕشتنی چەند دانە گەوهەرێك لە فرمێسکەکانی چاوت لە خوێندنەوەی ئەم گەوهەرنامەدا و هاوخەمیی و هاوسۆزیی خۆت دەربڕە بۆ پاڵەوانانی ئەم چیرۆکستانە.

**نووسەر**

**٢٣_٢٤/٧ / ٢٠١١**

# دەبێت ئەو سوننەتەت بەسەردا جێبەجێ بکەم

**ئەم بەسەرهاتە لە زاری مامۆستا مەلا مەحمودی ئازادیی خۆیەوە وەرگیراوە:**

سوننەتەکانی پێغەمبەری ئازیز (دروودی خوای لەسەر) لە بەرزترین ئاستی ئینسانی و تەندروستی و شارستانیی و رۆشنبیرییدایە بۆ ئینسان، بۆ نموونە سەرنجی خەڵکی ئەورووپا و ئەمەریکا بدە، کە زۆر کەس پێیان سەرسام بووە، دەبینی بەرسمێڵ دەکەن بەر لەوەی موسڵمانیش بن، تەنها وەك پاك و خاوێنی و جوانی ڕوخسار.

مامۆستا مەلا مەحمودی ئازادیی لە سەردەمی ئاوارەییدا لە ئێران دەچێتە شاری (سەردەشت)، لەوێ دەچێتە مزگەوتێك، دەبینێ تەرمی مردوویەك کەوتووە و کەس نییە بیشوات، بۆیە مامۆستا هەستێکی دینیی هانی دەدا کە بیشوات، لە ئەنجامدا ئاوی بۆ گەرم دەکا و قۆڵی لێهەڵدەماڵێ و ئەوانەی لەوێ دەبن تەرمەکەی بۆ دەخەنە سەرتەختەی مردووشۆرەکە، کە مامۆستا دەچێتە سەر تەرمەکە تەماشا دەکا سمێڵی دەڵێی دەسکە کەوەرە، بە جگەرەش زەرد بووە، شتێکیان داوە بە سەر دەموچاوی دا، مامۆستا بۆی دەردەکەوێ مردووەکە کاکەییە، بەڵام لە دڵی خۆیدا دەڵێ: هەر بیشۆم باشە، پێش هەموو شتێ سمێڵی بۆ ڕەزبڕ دەکا و بۆی دروێنە دەکا و ئینجا دەست دەکا بە شۆردنی، کاتێك خزمەکانی دەزانن دەست دەکەن بە گریان و نارەزایی دەربڕین و دەڵێن: مامۆستا سوکایەتی بە مردووەکەمان کردووە، دەسەڵاتیان نابێ ئەگینا لە خزمەت مامۆستادا بێئەدەبیشیان دەکرد.

# ئەجەل لە بیردا نەبوو، لە سەتڵی ئاودا بوو!

سەبارەت بەم بەسەرهاتە، خۆم هەردوو ماڵەکە دەناسم و ئاگاداری هەردوو رووداوەکەش بووم:

لەگەڵ هەر رووداوێکی وەك ئەم رووداوەدا باشتر بۆمان دەردەکەوێ و دڵنیا دەبین کە ئەجەل شتێکی حەتمییە و پاش و پێش ناکا، ئەگەر کەسێکیش کۆتایی بە ژیانی نەهاتبێ، لە رووداوی زۆر سەیر و سەمەرەشدا رزگاری دەبێ.

لە شاری سلێمانی و لە گەڕەکی مەجیدبەگ، ساڵی (١٩٩٥) منداڵێك بە ناوی (ئاراس موحەممەد) کە خەڵکی گوندی (سەرگەڵوو)ە، دەکەوێتە بیرێکەوە، کە (٣٢) مەتر قوڵ دەبێ، بە قەدەری خوا ئاوی تێدا نابێ، دوای نزیکەی دوو سەعات و نیو منداڵەکە دەهێننە دەرەوە، بەڵام تەماشا دەکەن نەمردووە و ماوە، هەتا کاتی ئەم نووسینەش ماوە و ئێستا گەنجێکی موسڵمانە و زۆربەی نوێژەکانی لە مزگەوت و لە ڕیزی یەکەمی جەماعەتیشدا ئەنجام دەدات، بگرە زۆر جاریش بانگ دەفەرمووێت.

لە کاتی دەرهێنانەوەیدا دوو جار پیاویان بە گوریس داهێشتبووە ناو بیرەکە، بەڵام لە دە مەتر زیاتر بەرگەیان نەدەگرت و هاواریان لێ بەرز دەبووەوە کە هەوا نەماوە و خەریکە دەخنکێن، ئەوانیش هەڵیاندەکێشانەوە، ناچار گەڕان بە دوای بیرهەڵکەنێکدا، دوای دووسەعات و نیو دۆزیانەوە و دەریانهێنایەوە.

پورزای ئەم کوڕەی کە لە ناو ئەو بیرەدا نەخنکا کە هەر دراوسێی ماڵی ئاراس دەبن، منداڵێك بوو بە ناوی (بیلال)، لە تەمەنی دوو ساڵی دا بوو، لە ماڵەوە لێیان ون دەبێ، زۆر دەگەڕێن بە دوایدا، دوایی دەڵێن لەوانەیە ئەمیش کەوتبێتە ناو بیرەکەوە، دەچن دەبینن بیرەکە سەری داپۆشراوە، ئیتر بێئومێد دەبن، پاشان یەکێکیان دەچێتە حەوشەی دواوەی

ماڵی خۆیان دەبینێ سەتڵێك ئاو دانراوە و منداڵەکە چووە سەیری وێنەی خۆی کردووە لە ناو ئاوەکەدا، کەوتووەتە ناوی و خنکاوە، بێئەوەی سەتڵەکەش قلپ ببێتەوە!.

پاکیی بۆ ئەو خودایەی (ئاراس)ی لە بیرێکی سی و دوو مەتری دا لە مردن ڕزگار کرد و لە سەتڵێکی سی و دوو سانتی مەتری دا، کۆتایی بە ژیانی (بیلال)یش هێنا.

# کفنی بۆ کابرا هێنا. کەچی بە نسیبی خۆی بوو!

**حاجی محێدین چنگیانی گێڕایەوە:**

لە گوندی هەرمێلەی نزیکی چوارتا پیاوێك زۆر نەخۆش دەبێ کە دواجار دەکەوێتە سەرەمەرگ، لەو کاتەشدا تەنها ژنەکەی لە لای دەبێت، کە ئێوارە خەڵکی لەسەر ئیش و کار دەگەڕێنەوە، ژنەکەی بانگی دراوسێیەکیان دەکات و دەینێرێت بۆ چوارتا کە کفنی فریا بخات، کابراش هەندێك شتی پێ دەبێت دایدەنێت و بە کوڵەغار ڕادەکا و بە ماوەیەکی کەم دەگاتە چوارتا و کفنەکەی بۆ دەکڕێت و خێرا دەگەڕێتەوە، سا بەڵکو فریای بخات، کاتێك دەگاتە بەرەوە ئەو نەخۆشەی بە لۆکە ئاویان دەکرد بە دەمیەوە، کەمێك هێواش بووەتەوە و بۆ سبەینێ چاکتر دەبێت و بۆ دوو بەیانی هۆشی دێتەوە و دەکەوێتەوە قسەکردن و خنەخن کردن.

بە بڕیاری پەروەردگاری زانا، ئەو پیاوەی کفنەکەی هێنا نەخۆش دەکەوێت و دەمرێ، کفنەکە بە نسیبی خۆی دەبێ و کابراکەی تریش کە لە حاڵی گیانەڵادا بوو بە تەواوی چاك دەبێتەوە و هەتا نووسینی ئەم چەند دێڕەش هەر لە ژیاندایە کە نزیکەی بیست و شەش ساڵ دەکات!

# ئەجەل بەدواتدادەگەڕێ بالە مالیش نەبیت

لە زمانی مامۆستا (مەلا مەحمودی ئازادیی)ەوە بیستومە، ئەویش ڕاستەوخۆ لە زمانی مامۆستا (مەلا حەمە یوسف)ی بیستووە لە مەریوان:

پیاوێك دوو گەلابەی هەبوو، ڕۆژێك بۆ ئیشکردن لە ناو شاردا گەڕابو، بە گەلابەکەوە خۆی دابوو بە مالێکدا و لایەکی ڕووخاندبوو، کە دابەزیبو بە هەلەداوان ڕادەکات بزانێ کێی کوشتووە، خەلکی گەڕەك بەرەو پیری ڕادەکەن و پێی دەلێن خەمت نەبێت، بە خوا بەختت هەبوو، کەسیان لە مالێ نەبوو، چوون بۆ گەڕان و سەردان بۆ شارێکی دیکە، کابرا زۆر دلخۆش دەبێت و ناونیشان و ژمارەی تەلەفون و تەسکەرەکەی دادەنێت و دەلێ: من کارم هەیە پێیان بلێن چەندی تێچوو چاکی بکەنەوە لەسەر من وخۆم لە ئەستۆی دەگرم، بەلێ گەلابەکەی دەباتە لای وەستا و دەڕواتە مالەوە.

بۆ ڕۆژی دوایی کابرا سوار گەلابەکەی تری دەبێت و بەرەو شارێکی دیکەی ئێران بەڕێدەکەوێت، لە ڕێگە قەمەرەیەك خۆی دەکات بە ژێر گەلابەکەیدا و پان دەبێتەوە و کەسیان دەرناچن، کابرا دەگیرێت و تەرمەکان دەردەهێننەوە، دەردەکەوێت کە خێزانێکی تەواو بوون، بە باوك و دایك و مندالەکانیانەوە.

ئەوەی مایەی سەرسوڕمان و هەلوەستە لەسەرکردنە لەم بەسەرهاتەدا ئەوەیە، لە کاتی لێکۆلینەوەدا دەرکەوت کە ئەو خێزانەی کەوتوونەتەوە ژێر گەلابەکەوە و هەموویان مردوون، خاوەنی ئەو خانووە بوون کە ڕۆژی ڕابردوو کابرا بە گەلابەکەی تری لە خانووەکەی دابوو، کەسی تیا نەبووە.

# ئەجەل ڕێی لێدەگرێت

**لە زاری مامۆستا مەلا مەحمودی ئازادییەوە بیستوومە:**

سایەقی پاسی خەت بوو، لە ڕێگە سەیارەکی پڕ لە شووتی پێشی دەکەوێت، سایەقی پاسەکە تەماشا دەکات مارێکی گەورە لە ناو شووتیەکانەوە سەر دەردێنێ و خۆی ون دەکات، سایەق پاسەکەش خێرا خێرا هۆڕن لێدەدات و سایەق سەیارە شووتیەکە تێدەگەیەنێت، کە ڕاوەستان ڕای کرد و خێرا بۆی باس کرد، وتی: ماڵئاوەدان لە ناو شووتیەکاند مارێکی ئاوا و ئاوا گەورەی تێدایە، بۆ بچێتە شار و بە کەسێکەوە بدات، با لێرە بیکوژین.

ئەملاولای سەیارەکە دەگرن و دەست دەکەن بە شووتی داگرتن بۆ ئەوەی دەستیان بکەوێتە مارەکە و بیکوژن، لەو کاتەدا مارەکە سایەقی پاسەکە غافڵگیر دەکات وپێوەی دەدات، کابرا هاوار دەکات و تا دەیگەننە خەستەخانە گیانی دەردەچێت و دەمرێت.

# مەرگی خۆی لە دارەمەیتەکەدا دی!

**مامۆستا ئەبوبەکری سدیقی بـۆی گێڕامەوە:**

لە گوندێکی ناوچەی کۆیە چەند ساڵێك بوو دانیشتوانەکەی دارەمەیتیان نەبوو مردوی پێ بگوێزنەوە بۆ گۆڕستان، زۆریش پێویستیان نەبووە، چونکە کەم کەم خەڵکیان لێ مردووە، بەڵام وتیان: ناکرێ هەر کەسێك بمرێت، بڕۆین بۆ گوندێکی تر بۆ دارەمەیت، هەرچۆنێ بێت

لەسەر ئەوە پێك هاتن دارەمەیتێك دروست بکەن، پیاوێکی ناو ئاواییش زۆر نارازی دەبێ و دەڵێ: من ڕازی نیم و یەك فلسیش نادەم و پێویسـتم بە دارەمەیت نییە، بەڵام خەڵکی گوندەکە گوێ بە کابرا نادەن و بڕیار دەدەن بە دروستکردنی، دەچنە لای دارتاش بە دروستکردنی دەدەن.

کاتێك دارەمەیتەکە دێننەوە، ئەو کابرایەی کە ڕازی نەبوو لە ناو ئاوایی، کە زۆریش ڕوو لە خواو نوێژکەر نەبوو، کە دارەمەیتەکە دەبینێ ڕادەچڵەکێ و ڕەنگی تێکدەچێت و هەڵدەبزرکێ و دەڵێ: (( ئێمە ئەمەمان بۆچی بوو؟! کەی ئێمە یەکمان لەسەر ئەمە کەوتووە؟!))، بەو جۆرە پێناخۆش بونی خۆی دەردەبڕێ، بەڵام لە لایەن (الله)ەوە بڕیار دراوە، کە دەبێ یەکەم تەرم سواری ئەو دارەمەیتە بکرێ، تەرمی ئەو بێ کە زۆر لێی دەترسا و نارازی لێ دەردەبڕی.

بەڵێ، یەکەم تەرم تەرمی ئەو بوو بەو دارەمەیتە گوێزرایەوە، بۆ گۆڕستان و بوو بە میوانی شاری خامۆشان!

بە هەمان شێوە حاجی جەمیل لە شارۆچکەی چوارتا لەگەڵ تەرمی مردوویەکدا دەچێتە سەرگۆڕستان، کاتێك تەرمەکە دەبەن، دەبینن گۆڕەکە تەواو نەبووە و بەردێکیان لێ یاخی بووە بۆیان هەڵناکەندرێ، زۆر هەوڵ دەدەن و چەند کەسێك یەك بە دوای یەکدا دەچنە ناو گۆڕەکەوە و هەوڵی تەواو دەدەن، هەر کەسە پارچەیەکی لێدەکاتەوە، حاجی جەمیلیش خۆی تورە دەکات، لەو کاتەدا لەلای خوارووی گۆڕەکەوە ڕاوەستابوو، شوێنی گۆڕستانەکەش لێژ و تەلان بوو، ئەوەبو لە نێوان دوو دەوەنەوە خۆی ڕادەپسکێنێ، دەستێکی بەم دەوەنەوە و دەستەکەی تری بەوی تریانەوە دەگرێت و دەڵێ: کورە خۆتان لادەن (بە گاڵتەوە) ئێوە کەی بەشەرن، ئیتر ئەوە کۆتا وشە بوو لە دەمی حاجی جەمیل هاتە دەرەوە، هەر بەو حاڵەتەوە کە دەستی بە دەوەنەکانەوە گرتبوو، گیانی دەرچوو، ئەو دارەمەیتەش کە تەرمی مردووەکەیان پێ بردە سەر گۆڕستان، تەرمی حاجی جەمیلیان پێ هێنایەوە بۆ ناو ئاوایی و شۆردیان و نوێژیان لەسەر کرد و پێ هەڵگەڕانەوە بۆ گۆڕستان و ئەویشیان بە خاك سپارد.

# ئەوەی لای بەندە خەیاڵە.لای خوا بەتاڵە!

**مامۆستا موحسین ئەمینی، بۆی گێڕامەوە وتی:**

مامی باوکم لەسەر جێگای مردن ڕاکشابوو، لە سەرەمەرگدا بوو، بە لۆکە ئاومان دەکرد بە دەمیەوە، هەتا دەهات هیلاکتر دەبوو، کە گەیشتینە شەو کەوتە گیانەڵاو دەستمان لێشۆرد، یەکێك دەیووت دەژی، هەزار دەیان ووت دەمرێ، چەند جاریش وەسێتی کرد بۆ باوکم کە ئەو تەرمەکەی بشۆرێ، باوکیشم کە زۆر مامی خۆش دەویست و زۆر خۆی بە دڵسۆزی دەزانی، هەردوو قۆڵی هەڵماڵیبوو، هەر دەهات و دەچوو، بە دەنگی بەرز دەیووت: بە خوا لە خۆم زیاتر کەس نایشوات، چەند ساڵە یەکترمان خۆش دەوێت و خۆیشی بە شایەتی هەمووتان چەند جار وەسیەتی کردووە من تەرمەکەی بشۆم، چونکە هەر حەڵاڵمان جیا بووە، ئێستا هەر ئەوەندەم لە دەست دێ چۆن تەمەڵی تیا دەکەم؟!.

چەند جار ئەم قسەیەی دووبارە و سێبارە دەکردەوە: هەر خۆم تەرمەکەی دەشۆم، کەس بانگ نەکەن بۆ شۆردنی تەرمەکەی، بە ڕاستی قەبوڵی ناکەم، باشە باش، کورە کەس بانگ ناکەین، خوا دەکات تۆ دەیشۆیت، زۆریشت مەمنون دەبین، لەو کاتەی باوکم گەیشتە لای مامی کە زۆر شپرزە و شەکەت بوو، مامی باوکم چاوی هەڵهێنا و بە باوکمی وت: ڕۆڵە ئەوە هاتی؟ ئۆخخەی ئیتر بشمرم قەیناکە، چونکە کە نەوچەوانی تۆم بینی ژانی لەشم شکا، توخوا ڕۆڵە خۆت تەرمەکەم بشۆرەو مەهێڵەکەس بمشۆرێ، ئەویش بە دەم فرمێسك و گریانەوە دەیوت: مامەگیان بەسەرچاو، تۆ چۆنت پێخۆشە وادەکەم.

دەبێ لە خەزێنەی غەیبی خوادا چۆن بڕیاری ئەم چیرۆکە ڕاستەقینەیە درابێ و ئەم بەسەرهاتە کۆتاییەکەی بە کوێ بگات؟ بەڵێ خۆر ئاوا بوو، ئەستێرەکان کەوتنە جریوە جریو، دەردەدارو گرفتارەکان پەردەی تاریکی شەو دڵ ودەروونی دەگوشین، لە ترسی ئازار و ژان و ناسۆری خۆیان، هەستیان ڕاگرتبوو، چاوەڕێی شەپۆلی ژان و سۆی دەرد و نەخۆشیی خۆیان دەکرد، هەموو خزمانیش چاوەڕێی فریشتەی گیانکێشان بوون، بەڵام

شەوەزەنگی ئەم شەو وردە وردە لەگەڵ داهاتنی تاریکی، باری گرانی لەسەر گیان و لاشەی مام عەلی کەنەفت ئاسان کرد، چاوەکانی هەڵهێنان، کەوتە جموجوڵ و ناڵەناڵ، هەتا کەوتینە بەرەبەیان تەواو هێواش بووەوە و ئومێدی ژیانی لێدەکرا و خزمان لەبەر خۆیانەوە دەیانوت: ئەم جارەش مردنی ئیزندا، بەڵێ لەگەڵ خۆرکەوتنی نوێدا داوای خواردنی کرد و دایاننیشاند و هێدی هێدی کەوتە قسەکردن و هەواڵ پرسینی فلان و فیسار.

هەتا دەمەو عەسر تەواو هێزی تێکەڕایەوە و وتیان: ئەرێ کوا گۆچانەکەی مامە عەلی فرێتان نەدابێ کورگەل؟ بەڵێ گەڕان گۆچانەکەیان دۆزیەوە و ئیتر بردیانە دەرەوە، سەرناویان پێکرد و بۆ دووبەیانی و سێ بەیانی خلەخل کەوتە گەڕان و پێی گرتەوە و چاك بووەوە، باوکی مامۆستا موحسینیش کە خۆی مات کردبوو بە نیازی شۆردنی تەرمی مامی، نەخۆش کەوت و کەوتە و سەر جێگا، مەرگ مۆڵەتی نەدا و کۆچی دوایی کرد، ئینجا مەرگ مۆڵەتی کاکەمینەی نەدا و گیانی ئەمانەتی تەسلیم کردەوە و لە دوای کاك ئەمین، مامە عەلی کە لەسەرەمەرگدا بوو (١١ تا ١٢) ساڵ ژیانی بەسەر برد، ئینجا مرد و کەسێکی تر تەرمەکەی شۆرد.

پێشینان ڕاستیان وتووە: (ئەوەی لای بەندە خەیاڵە، لای خوا بەتاڵە).

# ئەگەر بۆ لای نەخۆش چوویت

# مردنت لە یاد نەچێ!

لە ساڵی (١٩٧٢) لە گوندی (کوڕەداوێ)ی شاربازێڕی سەخت، کە ئەو کاتە من قوتابی پۆلی سێی سەرەتایی بووم، ئافرەتێك هەبوو بە ناوی (پوورە خورشید)ە، نەخۆش کەوتبوو، زۆر هیلاك بوو، خەڵکی دەستە دەستە دەچوون گەردنی خۆیان پێ ئازاد دەکرد.

ماڵی باوکی لە گوندی (کونجرین) بوو، کە ئەو کات بە پێ هاتوچۆ دەکرا، نزیکەی سەعاتەرێیەك دەبوو، کاتێك مام سابیری باوکی خورشیدەخان هەواڵی نەخۆشیی کچەکەی پێ دەگات، لە ماڵەوە ئیزن دەخوازێت و دەڵێت: بە خوا خێزانی ماڵێ دەچمە سەردانی ئەو کچەتیوەم، نەوەکو دیار ئاخیرەتی بم و نەیبینمەوە، مردن بە پیری و گەنجیی نییە، دەڵێن باوکە گیان با لە خزمەتتا بێین، وتبوی: ڕۆڵە جا ئێوەم بۆ چییە؟، چوار هەنگاوە و منیش لە گوێز ساختڕم، نەوەڵڵا ڕۆڵە کەسم ناوێ، خۆتان لە ئیش و کار مەکەن وماڵەکەش جێمەهێڵن، زستانە دونیا هەزار شت هەیە، بە خوا منیش سەفەری خۆم ناخەمە بەیانی.

بەڵێ مام سابیر دوای عەسر بەڕێدەکەوێ و بە پێ و بۆ نزیکی ئێوارە دەگاتە کوڕەداوێ، لە ڕێگە پیاوێکی تووش دەبێ بە زۆر خولقی دەکا و وەعدی لێوەردەگرێ کە ئێوارە لە خزمەتیدا بێت، مام سابیریش بە ناچاریی بەڵێنی پێ دەدا کە ئێوارە میوانی ئەو بێت، هەرچەندە ماڵی لە کەناری گوندەکە دەبێت و میوان کەم ڕووی تێدەکەن مەگەر بە خولقێکی زۆر، بەڵام خوا ئەم میوانەی بە نسیب دەکات.

مام سابیر دەچێتە ماڵی کچەکەی و هەواڵی دەپرسێت و لە لای دادەنیشێت، گوێی لە قیڕەی مریشك و کەڵەشێر دەبێ، دەڵێ مشوری من مەخۆن میوانی ماڵی عەبدوڵڵای حاجی حەمە میرزام، دەڵێن: نەبووە و نابێ، دەڵێت: بە خوا وەعدم داوە و سەریشم دانابێت دەچم، ڕۆڵە (وەعد و بەڵێن لە ئیمانەوەیە) خۆ ئێمەش خۆمان بە موسڵمان دەزانین.. بەڵێ، تا خۆرئاوا لە لای کچەکەی دەمێنێتەوە، ئینجا دەڕوات بۆ مزگەوت بۆ نوێژی ئێوارە، دوای نوێژ

لەگەڵ خانەخوێکەیدا دەڕواتەوە، دوای نان و چا خواردن، هەست بە لەش تێکچوون و نەخۆشیی دەکات، هەڵدەستێ دەڵێ: ماڵتان ئاوەدان بێت ئیتر من دەچم لە ماڵی کچەکەم ئیسراحەت دەکەم، مۆڵەتی لە خاوەن ماڵ وەرگرت و بەدەم لەرز و تاوە خۆی گەیاند بووە ماڵی حاجی مەلا عەزیز، کوڕی حاجی کوێخا تۆفیقی گەورەی ئاوایی، وتبووی: حاجی مەلا عەزیز وەرە و بۆ خوا ئاگادار و شاهێد بە، کە من ئێوارە میوانی عەبدوڵڵا حەمە میرزا بووم بۆ نانخواردن، بە خوا هیچ کەموکوڕییەك لە میوانداریيەکەیدا نەبووە و ئەگەر من شتێکم لێهات، ئەو پیاوە هیچ خەتای نییە، ڕازی نیم کەس لە گوڵ کاڵتری پێبڵێ.

حاجی مەلا عەزیزیش هەر چۆن مام سابیر پێیوتبوو ئاوا وەسیەتەکەی بۆ گوێ لێگرتبوو، مام سابیر وتبووی: جا تەرمەکەشم بەرنەوە کونجرین و خەبەر بدەنە موستەفای کوڕم، گۆڕم بۆ هەڵکەنێت، حاجی مەلا عەزیزیش بۆ شۆخی دەڵێت: کوڕە عەبدوڵڵا کەی نانی داوە بە خەڵك؟!، ئەترسم بە نانەکەی ئەو بمری، مام سابیر وەسیەت و قسەی خۆی دەکات و دەچێتە ماڵی کچەکەی، لەوێ زۆری پێناچێت گیانی دەسپێرێ و دەمرێت.

خورشیدەی کچیشی کە نەخۆش و کەنەفت لەسەر جێگەی مردن بوو، بە لۆکە ئاویان لە دەم دەکرد، هەتا ئێستا کە ساڵی (٢٠١٠) زایینییە لە ژیاندایە، کە لەو کاتەوە (٣٦) ساڵی تەواوە، ئێستاش لەشی لە زۆر کەسی تر ساختره و زۆریش بە جەوهەر و دەروون بەرزە.

زۆر گەنج و لاو جوان، خۆی دەڕازێنێتەوە و خۆی قۆز و گوڵاو پرژێن دەکات، بەڵام مردن بەرۆکی پێ دەگرێت و مۆڵەتی کەشخەییکردن و کوڕێنیی نادات، زۆر منداڵ بە ئومێدی تەمەنی درێژەوە سەدان خەیاڵ پلاو دەکات، بەڵام لە نزیکترین کاتدا لاشەی ناسك و بێتاوان و بێگەردی دەخرێتە گۆڕ، چەندین بووکیان ڕازاندەوە و لە شەوی خەنەبەندانذا خۆی، یان هاوسەرەکەی دەمرێت.

ساڵی (٢٠٠٨) چووم بۆ کەلار، لە ڕێگە سەیارەیەکم بینی سەروبن وەرگەڕابوو، وتیان: ئەوە بووك و زاوایەکی تێدا بوو لە کاتی گواستنەوەی هاوسەرەکەیدا لێرە وەرگەڕان، بووکەکەمان بە مردوویی لە سەیارەکە دەرهێنا.

لە کۆتایی پەنجاکاندا لە بەنداوی دووکان دە کەس بە بەلەم و بە ناو سەددەکەدا بووکیان گواستبووەوە بۆ بەری (قەرەسرت)، زاواو وکەسوکاری زاواش لەو بەر ئاوەکەوە چاوەڕێیان

کردووە، لەبەرچاویان بەلەمەکە وەرگەڕا و بووکەکە و دەکەسەکەی لەگەڵیدا بوون هەموویان خنکان، زاوا و کەسوکاری زاواش بە دەستی بەتاڵ، بەڵکو هەتا ئێوارە گەڕان ئینجا تەرمی بووکەکەیان بردەوە بۆ ماڵی باوکی.

## بۆ خواژیان. ماندووبوونی دەوێت!

**لە زمانی مامۆستا مەلا عەبدوڵڵا ئارمردی، ناسراو بە مەلا عەبدوڵڵای چوارتا بیستوومە:**

لە حەفتاکاندا لە گوندی (واژە)ی شارباژێڕ پێشنوێژ و وتارخوێن بووم، کەسانێکم دەبینین زۆر عەشقی خوا بوون و زۆریش لە خواترس بوون ئاواتیان پێ دەخوازرا، لەگەڵ ناوبردنی خوا و پێغەمبەردا ڕادەچڵەکین و تەزوو بە لەشیاندا دەهات، زۆر جار بە شێوەیەک دەگریان سەرت سوڕ دەما لێیان.

بەرات ((معاشی مەلا))ی مەلا، ساڵانە کۆدەکرایەوە، ناوی هەموو خەڵکی گوندەکە لە دەفتەرێکدا تۆمار دەکرا و لە کاتی سەری ساڵدا کە خۆیان دیارییان دەکرد) مامۆستا خۆی، یان کەسێکی مشوورخۆری ئاوایی بە سەر دەفتەرەکەدا دەچووەوە، بزانێ کێ هەقە مەلای نەداوە ئاگادار، دەکرایەوە.

منیش شەوێك دەفتەرەکەم هێنا بۆ مزگەوت، دوای نوێژ لە دەوری زۆپاکە خەڵکەکە دانیشت، منیش دەستم کرد بە خوێندنەوەی ناوەکان، هەر کەسم دەخوێندەوە ئەگەر پارەکەی دابوایە سەری بەرز دەکردەوە: (بەڵێ.. بەڵێ، قوربان من چۆن هەقی مەلا دوادەخەم، دووڕۆژیش لە پێش هەقە بەراتا تەسلیمم کردووە)، یەکێکی ترم دەخوێندەوە ئەگەر بەراتەکەی نەدابوو، سەری دادەخست، زۆر سەریەرز و کەیف خۆش نەبوو، بە دەنگێکی نزم دەیوت: ئەیدەم، ئەیدەم، قابیلە تەماع لە هەقی مامۆستا بکەم؟.

لەگەڵ ئەم ناو خوێندنەوە و ڕەدەڵ بەدەڵەدا، پیاوێکی بەتەمەنی خواناسی لێبوو، ناوی (دەروێش حسێن) بوو، دەستی کرد بە گریان، زۆر بە کوڵ دەگریا و خێرا خێرا فرمێسکی دەسڕی، منیش هەڵوێستەیەکم کرد، وتم: دەبێ دەروێش حسێن پارەی نەبێ و دڵی بە خۆی مابێ وا خێرا دڵی پڕ بوو غوربەتی هەستا، وتم: خاڵە دەروێش بۆ گریای، هیچ بووە؟ وتی: نەوەڵڵا مامۆستا، بەڵام بەم ناوخوێندنەوەی تۆ و بە وەڵامدانەوەی خەڵکەکە قیامەت و حەشر و حیسابم بیرهاتەوە، بە خوا ئەوێش هەروەکو ئێرە وایە، ئەوەی ئەرکی خۆی جێبەجێ کردبێ ئاوا سەری بەرز و ڕووی سوورە، ئەوەش ئەرکی خۆی ئەنجام نەدابێ ئاوا سەرشۆڕ و سەرکز و خەفتبارە و ڕووی نییە سەر بەرز بکاتەوە.

خودا سەری ئێمەش و دەروێش حسێنیش بەرز و بڵند بکات لە دونیا و دوارۆژدا.

شەوێکی تر هەر لە گوندی واژە دوای نوێژی عیشا پیاوێکی گوندەکە لێی پرسیم (ئەرێ مامۆستا ڕاستە دەڵێن هەر کەسێك منداڵێکی نەباڵق (ساوا)ی مردبێت، لەو دونیایکە دەرگایەکی دۆزەخی لێدەگرێت؟)، منیش وتم: بەڵێ ڕاستە و فەرموودەی پێغەمبەرە (سەلات و سەلامی خودای لەسەر بێت)، کابراش هەناسەیەکی خۆشی هەڵمژی، ووتی: ئۆخخەی، وەڵڵا شەشم مردوون، کەواتە یەك دەرگام ماوە، من ڕۆیشتم و ئەویش ڕۆیشت.

هەمان شەو بۆ نوێژی بەیانی دەهاتم، کابرام بینی و سەلامی لێکردم و بە کەیفێکی خۆشەوە ووتی: مامۆستا شوکر بۆ خوا دەرگاکەی تری دۆزەخی لێگرتم، ئەم شەو منداڵەکەی تریشمان مرد.

منیش لێرەدا ئەو بەسەرهاتەم بیر هاتەوە کە دەربارەی زانای خواناس و پایەداری گەلەکەمان بیستبووم، مامۆستا مەلا عارفی چنگنیانی شارباژێری: (جەنابی مامۆستا ڕەحمەتی خوای لێبێت، ڕۆژانە جوزئێك قورئانی خوێندووە، هەرگیز دەرفەتی ئەو ویردەی لە دەست نەداوە، ڕۆژێکیان دەست دەکات بە قورئان خوێندن و لە نیوەی جوزئەکەیدا دەبێت هەواڵێکی زۆر ناخۆش و جەرگبڕی بۆ دێنن، پیاوێك بە هەناسەبڕکە و هەڵەداوان دەگاتە خزمەتی مامۆستا و زۆر بە دەنگێکی خەفەت ئامێز، دەڵێ: جەنابی مامۆستا کوڕەکەتیان بە تەور کوشت، مامۆستاش دەڵێ: گیانی سپارد؟ کابرا دەڵێ: بەڵێ، هەر یەکسەر مرد، مامۆستای خواناسیش دەفەرموێت: تۆ بڕۆ با من نیوە جوزئەکەم تەواو بکەم

ئینجا خۆم دێم، هەتا ئیوە جوزئەکەی تەواو نەکات هەڵناسێت و ناشڵەژێت و سەریشی لێناشێوێت، خوێندنی قورئانەکەی لە ڕۆح و گیانی کورەکەی کاریگەری زیاتر بووە لەسەر ڕۆح و گیان و دەروونی، خوا لێی خۆش بێت و لە فیردەوسدا نیشتەجێی بکات).

لە ١٩٩٧/٤/٢٨ چووم بۆ پرسەی دۆستێکی خۆشەویستم، ڕۆژی پێشتر کچێکی گەنج و قورئانخوێن و بە شەرم و شکۆیان مردبوو، منیش لە کۆڕی پرسە و ماتەمینییەکەدا بێدەنگ دانیشتبووم، خەڵکەکە داوایان کرد ووتارێکیان بۆ بدەم، بەڵێ ناوی خوام لێهێنا، لە ناو وتەکاندا فەرموودەیەکی پێغەمبەرم گێڕایەوە: کە هەرکەس منداڵێکی بمرێت خۆگر و شوکرانەبژێر بێت و ناشکوریی نەکات، خودای گەورە لە فریشتەکان دەپرسێت: گیانتان کێشا؟ دەڵێن: بەڵێ، دەفەرموێت: بەندەکەم چی وت؟ دەڵێن: خوایە (حَمَدَكَ واسترجَعَكَ) سوپاس و ستایشی تۆی کرد و وتی: ﴿ إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّـا إِلَيْهِ رَاجِعونَ﴾، خوای گەورە پێیان دەفەرموێت: دەی کۆشکێکی سوپاسگوزاریی بۆ دروست بکەن لە بەهەشتدا.

لە دوای قسەکانی من پیاوێکی باڵابەرزی بە هەیبەت و شان و شکۆ وتی: دەی مامۆستا با منیش بەسەرهاتێکی خۆمت بۆ بگێڕمەوە کە حەوت کەس لە دانیشتوانی ئەم مەجلیسە ئاگاداری ڕاست و درۆی ئەم بەسەرهاتەن، هەناسەیەکی هەڵکێشا ووتی: لە تەمەنی گەنجێتیمدا مامۆستایەك ئەم فەرموودەی بۆ گێڕامەوە، ئەو دەمی تازە ژنم هێنابوو، ئەو فەرموودەیە کاری تێکردم و لە دڵمدا جێگیر بوو، لە دەروونمدا ڕیشەی داکوتا و تێکەڵی خوێنم بوو، بە درێژایی چەند ساڵەی ژیانم لەبیرم نەچۆتەوە و هەرگیز لە بیریشم ناچێتەوە و بە کرداریش وەکو موسوڵمان جێبەجێم کردووە، وتمان: چۆن جێبەجێت کردووە؟ وتی: لە ماوەی ژیانمدا لە دوای بیستنی ئەو فەرموودەیە بەدەستی خۆم تەرمی (١٢) کوڕی خۆم یەك لە دوای یەك لە ماوەی چەند ساڵێکدا خستۆتە گۆڕ و لە ناو گۆڕیچەدا ڕامکێشاون و بە خوام سپاردوون، بۆ هیچیشیان نەگریاوم، لە ترسی ئەوەی نەبادا خێرەکەم کەم ببێتەوە و کۆشکەکەم بچووك ببێتەوە و شەرمەزاری لای خوا ببم.

دەی خوا دوانزە کۆشکی ناوازەی بەهەشت بە خۆت و هاوسەرەکەت ببەخشێت.

هەر لەم بابەتەدا دیمەنێکی مەردانە و خواناسانەی مەلا عابیدی عەبابەیلێم وەبیر هاتەوە کە (لە زاری مامۆستای پایەبەرز، مامۆستا مەلا مەحمودی ئازادییەوە بیستومە و خۆی ئاگاداری

ڕووداوەکە بووە): لە ساڵی (١٩٦٣) کاتێك باری نائاسایی لە هەڵەبجە و چەند شوێنێکی تر ڕاگەیەنرا، مامۆستا مەلا مەحمود، فەرمووی: ئێمەش لە هەڵەبجە وەبەر ئەو شاڵاوە کەوتین، پیاوێکی خواناس هەبوو لە عەبابەیلێ ناوی مەلا عابید بوو، هەرچەند پیشەی مەلایەتیی نەدەکرد، سێ کوڕی هەبوون، یەکێکیان لای خۆی دەمایەوە لە عەبابەیلێ و دوانەکەی تریش دەهاتنە هەڵەبجە بۆ ئیش و کار و کاسبی، لە یەکەم ڕۆژی ڕاگەیاندنی باری نائاسایی و قەدەغەکردنی هاتووچۆ، هەردوو کوڕەکەی مەلا عابید هاتنە حوجرەکەی ئێمە لە مزگەوتی پاشا لە هەڵەبجە، بەڵێ دەرگای مزگەوتمان داخست و خوشتەمان لە خۆمان بڕی، وامان نیشاندا حوجرە چۆڵە و بۆتە هەوارگەی وێران، دەتگوت بایەقوش لێی خوێندووە، ماوەیەکمان بەو شێوەیە بەسەر برد، بە خوا لە ناکاو یەکێك لە کوڕەکانی مەلا عابید ڕاست بووەوە وتی: بە خوا من دەڕۆمەوە بۆ ماڵەوە، ئێستا باوکم و دایکم و کەسوکار دڵیان لە مشتیاندایە لە تاوی ئێمە، بە تایبەتی دایکم و باوکم ئێستا ئۆقرەیان لێبڕاوە و دونیایان لێ تاریك بووە، بە هەموومان لێی پاڕاینەوە و تکا و ڕجامان لێکرد و ئاڵقای دەست و قاچی بووین، بە گوێی نەکردین، وتمان: کاکە ئەمڕۆ کەس بە کەسە و ئەو سەرباز و چەکدارانە بکوژ و ببڕ، شەلم کوێرم ناپارێزم خەڵکی دەکوژن، ڕجای ئەو خوایەت لێدەکەین دامەزرێ و بە گوێمان بکە، کاکە دایکت و باوکت خەفەت بخۆن باشترە هەتا پرسەت بۆ دابنێن، کوڕە چووە کەلی شەیتان و نەهاتەخوار، دیار بوو ئەسپی ئەجەل سوارسەری بوو بوو، بە هەرحاڵ بە نیوەعاجزی ڕۆیشت و ئێمەش بە نابەدڵی خواحافیزییمان لێکرد، دیار بوو زۆر نەڕۆیشتبوو، تەقەیان لێکردبوو، کوشتبوویان.

ئێمەش هەر بە گومان ورتی ورتیمان پێکەوت و براکەی تریشیان هەستی بە شتێك کردبوو، بە ئاستەم وورتەیەکمان بکردایە سەرەنجی دەدا و دڵی دادەخورپا، وردە وردە خەیاڵ و چرپە چرپەکەی ئێمە زیادی کرد، براکەی تریشی کە لە حوجرە لای ئێمە مابۆوە، هات وتی: بە خوا عەریزەیەك دەنووسم و دەچم تەرمی براکەم وەردەگرمەوە، وتمان: کاکە نابێ، کێ دەڵێ برای تۆ کوژراوە، ئێمە ڕێگەت نادەین لەو دەرگایەوە ئەو دیو بکەویت و ناکرێ و نابێ، بەڵام حیسابی بۆ قسەی ئێمە نەکرد، وەکو دەڵێن تێیدا کول و کوێر بووین بێ فائیدە بوو، دەرپەڕ،ی دیاربوو بای ئەجەل ئەویشی هەڵگرتبوو، هەر لە دەرگای ئەودیو کەوت ئێمە لێی

بێ خەبەر بووین، کاتێك بەندکراوەکان ئازاد کران و ترس و لەرز کەم بووە و هەواڵی تەواومان بۆ هات، گیراوەکان وتیان: قوربیان کوڕەکەی مەلا عابیدیان (کوڕی دووهەمیان)، هێنا بۆ لای ئێمە، کاتێك ئەفسەری گەورە و کاربەدەست بە تووڕەیی و بەدەنگی بەرز لێی پرسی تۆ چیت؟ ئەمە بۆ لێرەیە؟ وتی: قوربیان من برام کوژراوە و منیش عەریزەم داوە بۆ لای جەنابتان بەڵکو تەرمەکەییم بدەنەوە، بەبێ ئەوەی بزانێ برای ئەو کێیە و چۆن و لە کوێ کوژراوە، وتی: تۆش برای ئەو موخەڕیبە (واتە : یاخی بوو ، دوژمنان بە پێشمەرگەیان دەوت (واتە: تێکدەر))، گۆربەگۆڕەی بڕۆن بیبەن، وەرە تۆ خەڵکی کوێی؟ وتی: خەڵکی عەبابەیلێم، وتی: ئەم موخەڕیبە هەموو لەوێوە هاتوون، بیبەن بۆ سەر تەرمی براکەی گوللەبارانی بکەن، هەر ئێستەش عەبابەیلێ تۆپباران بکەن، بەڵێ کوڕیان برد و بە ناهەق لەسەر تەرمی براکەی گوللەبارانیان کرد و قەسف و تۆپبارانی عەبابەیلێش دەستی پێکرد.

بۆ سبەینێ کە کوشت و بڕ نەما بوو، بە ناشی ئاو کەوتوو، خەڵکی لە ماڵەکان دەرپەڕین، بۆ هەواڵ زانین و دۆزینەوەی ونبووەکان و کۆکردنەوەی تەرمی کوژراوەکان، کە چووینە دەرەوە هەردوو تەرمی کوڕانی مەلا عابید بە سەریەکدا درابوون و خوێنیان تێکەڵ بوو بوو، هەردوو تەرمەکەمان هەڵگرتنەوە و شۆردمانن و بەرەو عەبابەیلێ هەڵمانگرتن، کە چووینە قەراغ ماڵان، ماڵ چۆڵ دیار بوون و دیار بوو پیاو هەموو لە دەوری مزگەوت بوون، ئێمە لە ئەوان بێ خەبەر وئەوانیش لە ئێمە بێ خەبەر، بەڵێ هەردوو تەرمەکەمان لە دوو دارەمەیتدا بەرەو مزگەوت بردن، کە چووین لەوێش تەرمێکی تری لێبوو، وتیان: ئەوە تەرمی کێن؟ وتمان: تەرمی هەردوو کوڕەکەی مەلا عابیدن، کابرا ئاخ و ئۆفی کێشا و دەستی بە ئەژنۆی خۆی کێشا و وتی: دە وەڵڵاهی دوێنێ قەسفی ئێرە کرا، دوانزە تۆپی پێوەنا، یانزەیان بەر قەراغی ماڵان کەوتن و زەرەریان نەدا، تەنها یەکێکیان کەوتە ناو ماڵان، ئەویش بەرماڵی مەلا عابید کەوت وتاقە کوڕەکەی تریشی کوشت و ئەوە تەرمەکەیەتی.

ئاخ ئاسمان بەرز و زەوی سەخت، بەڕاستی کارەساتێکی جەرگبڕە، بەڵێ من هەندێ لە فەقێکانی تر گەورەتر بووم، ڕایان سپاردم هەندێ قسە و ئامۆژگاریی بۆ بکەم، بۆ دڵخۆشییدانەوەی مەلا عابید و کەسوکارەکەی، هەر (بسم الله)م کرد و مەلا عابید فەرمووی: ڕاوەستە کاکە فەقێ، جا هەر بە بەینی سێ تەرمەکەدا دەهات و دەچوو، دەیوت: (لا إله إلا

(الله)، وتی: ئەم کوڕانە خوا بە منی داون، خواش بردونیەوە، هیچ دەسەڵاتی منی تێدا نییە، خەڵکینە خەمی مردن و کوژرانی کوڕەکانم نییە، تەنها و تەنها خەمی من ئەوەیە لە لای خوا لە ڕۆژی دواییدا سەری منیش و خۆشیان شۆڕ بکەن، ئەگەر وانەبێ خەمم نییە.

## تەرمی سێ برا لە یەککاتدا هاتنەوە

لە ولاتی سووریا سێ برا لەگەڵ دایك وباوکیاندا لە ماڵێکدا بە یەکەوە دەژیان، یەکێکیان گیرا بە سەریان، لە دوای ماوەیەك یەکێك لەو دوو برایەی لە ماڵەوە بوون نەخۆش کەوت، دوای تاقیکردنەوە ونازماییش دەرکەوت نەخۆشیەکە سەخت و ترسناکە، بۆیە پزیشکەکانی سوریا بە براکەیان ووت: بە پەلە بیگەیەنەرە تورکیا، براکەشی بە پەلە خۆی ئامادە کرد و بەرێکەوت بۆ تورکیا، بەڵام عەمەلیات ونەشتەرگەریی براکەی سەرکەوتوو نەبوو براکەی گیانی لە دەستدا، لە گەڕانەوەیاندا براکەی سەیارەیەکی سەریەخۆی بە دەربەست گرت و تەرمی براکەی سەرخست لەسەر سنووری سوریاوە بۆ ماڵەوە، لە ڕێگەدا سەیارەکە پەنچەر بوو، هەردووکیان دابەزین بۆ گۆڕینی تایەکە، کابرای شۆفێر بە برای مردووەکەی وت: تۆ برۆ دانیشە، بە خوا دەست لە هیچ نادەی، خۆم هەر ئێستا چاکی دەکەمەوە، ئەمە ئیشی خۆمە، برای مردووەکە لە قەراغێکدا شانی دادا.

کاتێك کاکی شۆفێر لە پەنچەری کردنی سەیارەکەی تەواو بوو، بانگی کابرای کرد، وەڵامی نەدایەوە، کە چوو دەستی لێدا تەماشای کرد هەر لەسەر ئەو لایەی شانی دادابوو جوڵەی نەکردبوو، گیانی دەرچوو بوو، کابرای شۆفێر زۆر ترسا و خەم و پەژارە دایگرت و ڕایکردە سەر شەقامەکە، ماوەیەکی زۆر دەستی ڕاگرت یەك سەیارە نەوەستا، چەند جار دەگەڕایەوە بۆ لای کابرا و گوێی بە هەناسەیدا دەگرت، بەڵکو زیندوو بێت، بەڵام ئەجەل ساغی و نەخۆشیی بۆ نییە، کاکی شۆفێریش کە زۆر تینی بۆ هات وترسی کەوتنەوەی شەوی لێ نیشت، ڕۆیشتە ناوەڕاستی شەقامەکە و هەردوو دەستی بڵاوکردەوە و ڕاوەستا، وەك بڵێ یان دەبێ لێم بدەن، یان دەبێ ڕاوەستن، سەیارەیەکی سەربازیی وەستا، کە لە پێشەوە

لەگەڵ شۆفێرەکە ئەفسەرێك سوار بوو بوو، هاتە رۆخی جادەکە، وتی: ها چیت دەوێت؟ وتی: بە قوربانت بم فریام بکەوە و باسەکەی بۆ گێرایەوە.

کاکی ئەفسەر دابەزی و سەیری کرد، ڕاستە، چووە سەر ئەو تەرمەیان کە ئێستا مردبوو، دەستی لێدا زانی ڕاستە مردووە، کە سەیری تەسکەرەو ناونیشانی کابرای کرد یەکسەر ڕەنگی تێکچوو و خەم وپەژارە دایگرت و ئاخێکی خەفەتاوی هەڵمژی، شۆفێرەکە خێرا لێی پرسی وتی: دەیناسی؟ خزمتە؟ ناسیاوتە؟ وتی: تەرمی براکەی تریشیان لە ناو سەیارەکەی مندایە، براکەشیان سەرباز بووە و کوژراوە، بە ناوەکەیدا بۆم دەرکەوت، وەرە هەر دوو تەرمەکە بخەرە سەیارە سەربازییەکەی منەوە و وەفاتنامەی براکەیانم بدەرێ و خەمت نەبێت، ئەمە دەسەڵاتی هیچمانی تێدا نییە و خەتای کەسیشی تێدانییە، قەزا و قەدەری خودایە.

## خۆڕاگریی و شوکرانەبژێری

**مامۆستا حەسەن پێنجوێنی دەیگێڕێتەوە:**

لە گوندێکی پێنجوێن پیاوێك هەبووە منداڵیان نەبووە، زۆریش تامەزرۆ و ئاواتی منداڵێکیان بوو، بۆیە داوای لە مەلای گوندەکە کردوە دوعا بە دەورەی بۆ بکەن، ئەوانیش دوعای بۆ دەکەن، لە پاش ماوەیەك منداڵێکیان دەبێت، دوای ماوەیەك منداڵەکە خشتیلە دەبێت و ڕۆژێکیان مامۆستا دەچێت بۆ مزگەوت قەرەباڵغیی دەبێت، دەپرسێت، دەڵێن: منداڵە تاقانەکەی فلان کەس مردووە، دەڵێ زۆرم خەفەت خوارد، وتم: ئاواتی منداڵێك بوو بەو پیرییە و لەو تەمەنەدا ئێستا دەبێت حاڵی چۆن بێت؟ لەم قسانەدا بوو مام (.....) هات، جلێکی جوانی لەبەر بوو، خۆی گۆڕی بوو، قۆز و کەشخە بوو، وتم: لەوانەیە منداڵەکەی ئەو نەبێت، بە هەڵە وایان وتووە، بەڵام کە هات وتی: مامۆستا دەزانی منداڵە تاقانەکەم مرد؟ بەبێئەوەی بگری، وتم خوا پاداشتت بداتەوە، وتی: ئەزانی خۆم بۆچی گۆڕیوە؟ ئەو ڕۆژەی

لە دایك بوو جلێکی تازەم لەبەر کرد و خۆم گۆڕی خۆم بۆن خۆش کرد، بۆیە ئەمڕۆش وام کرد تا نەبێتە ناشکوریی.

# لە وادەی دیاریکراودا

# تەرمەکەی لە جیاتی خۆی هات

**کاك ئازاد خۆی بۆی گێڕامەوە کە بە چاوی خۆی بینیویەتی و بەسەر خۆی هاتووە:**

سالّی (١٩٨٢) مانگی (٥) واتە (ئایار) بوو، لە هەیئەی کەرکووك بەند کرابووم، ڕۆژێکیان کوڕێکی گەنجیان کردە ژوورەوە بۆ لامان، دوای ڕۆیشتنەوەی جەللادەکە و داخستنەوەی دەرگا سامناکەکان بەخێرهاتنمان کرد و لە پاشاندا بووینە ناسیاو، زۆر بەسەرهات و یاداشتی سەرسوڕهێنەرمان بۆ یەکتر گێڕایەوە، باسی ئەو شوێنە سامناکانەی بۆ کردم کە جەللادەکان نیشانیان دابوو، لە دیمەنی سزادانی تۆقێنەر و ئازەلّستان، هەتا زراویان بتەقێ و زوو خۆیان خەتابار بکەن، وەکو سەدان کەسی تری بێتاوان.
سەرەنجام خۆیان شایستەی ئیعدام کردن و لەسێدارەدان و گوللەباران کردن بکەن لە ترسی ئەو هەمو ئازار و ئەشکەنجە دڕندانەیەی بەعسیەکان، لە یەکێك لە بەسەرهاتەکاندا، کاك ئازاد کە ئەفسەری ملازم بوو وتی: جارێکیان لە مەسیف سەلاحەددین مەوعیدم هەبوو لەگەلّ (قادر زیرەك)ی گۆرانی بێژ، لەسەر بەرزاییەکی کەناری شەقامەکە چاوەڕێم دەکرد کە سەعات نۆ بگاتە جێ، خولەك بەخولەك چاوەڕێم دەکرد هەتا سەعاتِ نۆی ڕێك، لەو کاتەدا تەرمی مردوویەك بە بەردەممدا تێپەڕی و ڕای چڵەکاندم، یەکێك لەو کەسانەی لەگەلّ تەرمەکەدا دەڕۆیشتن بانگی کردم، وتی: کاك ئازاد لێرە چی دەکەیت؟ وتم: مەوعیدم هەیە لەگەلّ قادر زیرەك، دەبوایە ئێستا کە سەعات نۆیە لێرە بووایە.

وتی: ئەوەتا کاک قادر، ئەوە خۆیەتی! وتم: کوا کامەیە؟

وتی: ئەوە تەرمی کاک قادرە، لە ڕێگە بە ڕووداوی پێکدادانی سەیارە کۆچی دوایی کردووە، ئەوە تەرمەکەیەتی لە مەوعیدی خۆیدا ئامادە بووە! وتی: ئەوجا لەگەڵ تەرمەکەیدا چووینە سەر گۆڕستان و بە خاکمان سپارد، لە جیاتی بە                                                لە سەیرانگا، بە گڵکۆی ئەبەدییمان سپارد.

# مەلا و شایەر ئامۆژگاریی یەکتر دەکەن

مامۆستا مەحمودی ئازادیی، بۆی گێڕامەوە:

جارێکیان تووشی لۆتیەك (شایەرێك) دەبێ کە ئیشوکاری بریتی دەبێت لە گۆرانی وتن و شایی گێڕان، ئەمیش ئامۆژگاری دەکات کە کوڕێکی گەنجی وەکو تۆ لەو تەمەنەدا هەر ئیشێکت پێ خۆشبێ دەتوانی فێری ببیت و کاسبیەکی شەرەفمەندانە بکەیت و واز لە شایەری بێنیت، بە ڕاستی حەیفە بە کوڕێکی گەنجی وەکو جەنابت بوتری"لۆتی وبە جۆرێکی تر تەماشات بکەن لە کۆمەڵگادا و ناخۆشە وات پێبڵێن.

ئەویش بە وردی گوێی بۆ شل دەکا و پەیتا پەیتا بەڵێی بۆ دەکا تا لە قسەکانی دەبێتەوە، پاشان پێی دەڵێ: مامۆستا قەسەم بە خوا ئەوەندە کارێکی خۆش و بەدەستکەوتە، ئەگەر تۆش یەك ڕۆژ لۆتیەتی بکەی لە ژیانتدا، جارێکی تر مەلایەتی ناکەی!!

# ئەمە قسەی شێتە.یان خواناس!

پیاوێك لە كۆڕێكدا گێڕایەوە وتی:

لە ساڵی هەشتاكاندا بەیانییەك زوو ڕۆیشتم بۆ سەر گۆڕستانی سەیوان لە سلێمانی، لەبناری گۆڕستانەكە پێش ئەوەی بگەمە ناو گۆڕستانەكە و سەلام لە حازریەكان بكەم، بینم خەلیلە شێت لەو نزیكانە دانیشتبوو، سەلامم لێكرد و وتم: خەلیل بۆ لێرە دانیشتووی؟ وتی: دەمەوێ سەدانی ئەم ڕێبوارانە بكەم (مەبەستی مردووەكان بوو) و هەندێك قسەیان لەگەڵ بكەم.

وتم: ئەی قسەت لەگەڵ نەكردن؟ وتی: بەڵێ قسەم لەگەڵ كردن، وتم: چیت پێوتن؟ وتی: پێم وتن بۆ بار ناكەن؟ كاروانچیەكانیش وتیان: چاوەڕێی ئێوە دەكەین، بەجێتان ناهێڵین با هەمووتان بێن، ئینجا بار دەكەین و دەڕۆین، ئەوجا دەردەكەوێ كێ ڕاستی كردووە و كێ درۆی كردووە.

بەڵێ ئادەمیەكان هەموو گەشتیار و سەفەرین، بارگە و بنەیان بەتەواویی ناكەنەوە لە بەهەشت، یان لە دۆزەخ نەبێ، تۆش لە دونیادا سەفەریت، ماوەیەك لەم سێبەری درەختی دونیایە پشووت داوە لەگەڵ دۆستان، هاكا بەڕێكەوتیت بەرەو دوارۆژ!

# کەلەکنۆییەک بووە قۆچی قوربانیی و منداڵێکی لە سەربڕین ڕزگار کرد!

**مامۆستا مەحمودی ئازادیی، گێڕایەوە، وتی:**

پیاوێکی خەڵکی هەمەدان ناوی غوڵامەلی بوو لە ئێران، بۆی گێڕامەوە وتی: لە کاتی گرانی گەورەدا لە گوندی هەمەکەسی نزیك هەمەدان، ژن و مێردێکی بەتەمەن تەنها منداڵێکی شیرەخۆرەیان مابوو، دوای ئەوەی گرانیی قڕی تێخستبوون، خۆیشیان هێندەیان برسی بوو مردنیان بە ئاوات دەخواست!

کابرا پێشنیاری کرد بۆ ژنەکەی کە ڕازیبێت منداڵەکەیان سەربڕن و گۆشتەکەی بخۆن هەتا لە مردن ڕزگاریان بێت، منداڵەکەش لە زەلیلی و فراندنی چەتە و برسییەکان ڕزگاری بێت، چونکە ئەگەر خۆمان سەری نەبڕین و نەیخۆین، دز و جەردە لە برساندا لێمان دەستێنن و سەری دەبڕن و خۆشمان لە برسا دەمرین.

ناچار ژنەکەی پێی بە جەرگی خۆیدا ناو ڕێیدا، کابراش چەقۆیەکی تیژی وەك ئەڵماسی کرد بە بەر پشتێنەکەی دا و منداڵ خنجیلانە بێتاوانە ساواکەی باوەش کرد، منداڵەکەش دڵی خۆش بوو، لێوە سیس و وشکەکانیشی زەردەخەنەی ماتەمینی و مەرگی ناخافڵیان لێدەبینرا.

ساوای بێتاوان و دڵپاك وایدەزانی باوکی خواردنی بۆ پەیدا دەکات، نەی دەزانی دەیکاتە خواردن، وای دەزانی نێچیری بۆ پەیدا دەکات، نەیدەزانی باوکی دڵسۆزی لە ناچاریدا دەیکاتە نێچیر!

باوکی برسی و دڵ بریندار و دڵ پڕ لە ئازار بەدەم قوڵپەی گریانەوە منداڵەکەی بەخۆیەوە دەگوشی و منداڵەکەش زیاتر دڵی ئارام دەبوو بە نزیکی باوکییەوە و گوشینی بە خۆیەوە ترسی لە هیچ نەبوو، کاتێك لە ماڵ دەردەچن و دەیبات بۆ ئەو کێوە لەوێ سەری ببڕێت، لە باوەشی دای دەگرێت وتێر ماچی دەکات و بەدەم قوڵپەی گریان وهەڵڕشتنی ڕێژنەی

فرمێسکەوە، خواحافیزیی لێدەکات، پاشان لەسەر زەوی دایدەنێ و ڕاست دەبێتەوە چەقۆکە لەبەرپشتێنەکەی دەربهێنێ؛ ئا لەو کاتەدا خودای گەورە دەگاتە فریای ئەو منداڵە بەسەزمانە، ئا لەو کاتەدا ڕەحمی خوا دێتە جۆش و بڕیارێکی تر دێتە پێش، بەڵێ لەو کاتەدا باوکی داماو و جگەرسووتاو ئاوڕ دەداتەوە دەبینێ لەو لای ئەمانەوە وا دوو کەڵەکێویی (ئاژەڵەکێویی) خەریکی شەڕە قۆچن و سەرەنجام شاخیان لە شاخی یەکتر گیراوە و بۆیان دەرنایەتەوە، زۆرخۆیان ڕاوەشاند و هەوڵیاندا، بەڵام کابرا پەلاماری دان و خۆی گەیاندێ و هەڵمەتی دایە یەکێکیان و سەری بڕی و شاخی ئەوی تریانی دەرهێناو بەرەڵای کرد، ئیتر بەدەمەم شوکر و سوپاس و ستایشی خواوە منداڵەکەی کردە باوەش و تێر ماچی کرد و کەڵەکێوییەکەشی بە سەربڕاوی دابەشانیدا و بەرەوماڵەوە ڕۆیشت، تا زوو مژدە بداتە دایکی جەرگ بڕاو و کۆستکەوتوو!

پیاوەکە هەر لە دوورەوە هاواری لە ژنەکەی کرد: مژدە.. مژدە... ژنەکەش وا تێگەیشت مژدەی گۆشتی ناسکی جگەر گۆشەکەیەتی، بۆیە هێزی ئەژنۆی نەبوو هەستێ و بە ئەژنۆی خۆیدا دەکێشا، بەڵام پیاوەکە خێرا گەیشتە بەرەوە و خۆی کرد بە ماڵدا و لاکی کەڵەکێوییەکەی دا بە زەویدا و منداڵەکەی تێر ماچ کرد و کردیە باوەشی دایکیەوە.

دایکە هەر لە منداڵەکەی ورد دەبووەوە و ماچی دەکرد، بڕوای نەدەکرد ئەو بێت، چونکە لەو دەمەوە پیاوەکەی بردی بۆ سەربڕین ئەم بە خەیاڵ و ئەندێشەی پڕ لە ناسۆر و ئێش و ژانی، گۆشتی ناسکی تاقانەی پایزی ژیانی دەهێنایە بەرچاوی و عەقڵی نەیدەبڕی، بیری لەوە دەکردەوە ئەم ئێوارەیە سفرەو خوانێکی ڕازاوەمان هەیە! کە چەند مانگێکە نە هەر گۆشت، بگرە نانی وشك و تەنانەت گژ و گیاشمان دەست نەدەکەوت بیخۆین.

ئێستا چۆن سوپاسی خوا بکەم، من بەتەما بووم لە برسا گۆشتی منداڵەکەم بخۆم، ئێستا وا منداڵە برسیەکەم لەسەر سفرە دانیشتووە و گۆشتی کەڵەکێویی دەخوات، دایە و بابەی منداڵەکە لەسەر سفرەکە لە گۆشتی کەڵەکێوییەکە خۆشترە!

چەند سەیرە وا دایك و باوك دەبینن سوننەتەکەی ئیسماعیل جارێکی تر لە مێژوودا دووبارە دەبێتەوە، ئەم جارەش کەڵێکی قەڵەو و چەور بووە قوربانیی منداڵێکی بێگوناه و بێگەرد.

دایك و باوك بە دڵی خەفەت ئامێزەوە دەستیان کرد بە گۆشت خواردن، بەڵام ئێش و ئازاری ئەو بڕیارەیان لە دڵ دەرنەدەچوو کە سەعاتێك لەوەوپێش بە ناچاریی لەسەری ڕێککەوتن، ئازاری ئەو بڕیارە وەکو شوێنی تیرێك بوو لە جەرگیاندا کە دەرهاتبێ و شوێنەکەی سارێژ نەبووبێ!

## خوای گەورە دوژمنیشت بۆ موسەخخەر دەکا

کاك مەحمود هەڵەدنی بۆی گێڕامەوە: لە گوندی خۆیان (هەڵەدن) حاجی ڕەزا ناوێك لەسەر خەرمان خەریکی شەن کردن بووە، لە کاتی پشووداندا بینیویەتی وا زەردەواڵەیەك دێت دەنکە گەنم دەبات و ئەم دەشزانێت زەردەواڵە گەنم ناخوات، بۆیە کاری ئەم زەردەواڵەیە سەرنجی ڕادەکێشێ و ناچار شەنەکەی دادەنێت و شوێنی زەردەواڵەکە هەڵدەگرێ.
دوای ئەوەی چەند جارێکی تر زەردەواڵەکە دەنکە گەنمی برد، بۆی دەرکەوت بە کۆمەڵێ دار و دەوەنی ناوچەکەوە دەنیشێتەوە، حاجی دەچێت بزانێت زەردەواڵەکە ئەم دەنکە گەنمانەی بۆ چیە؟! دەبینێ چوار بەچکە چۆلەکە (زەرنەقوتە)ی بێپەڕو باڵ دەمدەکەنەوە و زەردەواڵەی کۆنە دوژمنیان هەرجارەی دەنکە گەنمێك دەخاتە زاری یەکێکیانەوە، هەتا تێر دەبن، هەموو ڕۆژێ ئەمە پیشەیەتی.
حاجی ڕەزا دەڵێ هەتا چەند ڕۆژ من لەوێ بووم، ئەو زەردەواڵە خێرخوازەم دەبینی ئەوە پیشەی بوو، بەو کارە خێرخوازیە هەڵدەستا، بۆیە یەکەم ار کە بینیم بانگم کرد لە حاجی عەزیزی خزممان، وتم: نەوەکو دوای کە باسم کرد خەڵکی باوەڕم پێ نەکەن، حاجی عەزیزیش بەچاوی خۆی ئەو دیمەنە سەیر و سەرنجڕاکێشەی بینی!

٢٠ / ١١ / ٢٠٠٦ ماڵی شێخ ڕەئوف داراغایی

# لەبەر منداڵەکانی گۆشتەکەی بۆ نەخورا

ئەم بەسەرهاتە کاك زاهیر خۆی ساڵی (٢٠٠٤) لە سلێمانی بۆی گێڕامەوە:

لە ساڵی (١٩٩٣)، سێیەم ڕۆژی جەژنی قوربان بوو، لە مزگەوت دەگەڕامەوە، دوای بەجێهێنانی نوێژی نیوەڕۆ، برادەرێکی خۆشەویستم بینی و فەرمووی ماڵەوەم لێکرد، ئەویش پێی خۆش بوو، وتی هەر بۆ سەردانی جەنابیشت هاتووم، کە چووینە ماڵەوە گۆشتی قوربانیان برژاندبوو، لەسەر سفرە دانرابوو، سفرەکەیان بۆ ئێمە جێهێشت و دەستمان کرد بە نان خواردن، من چەند پارویەکم خواردو لە دەرگا درا، وتیان بانگی تۆ دەکەن، منیش بە میوانەکەم وت: تۆ نانی خۆت بخۆ نەوەك من زۆرم پێبچێت و دوا بکەوم، لە ڕاستیشدا نزیکەی بیست خولەکم پێچوو، کە هاتمەوە سفرە هەڵگیرابوو، میوانەکەش بە تەنها دانیشتبوو، منیش نانخواردنم لە بیر نەما و باسم نەکردەوە.

لە ساڵی (٢٠٠٤) لە بازاڕی سلێمانی بە خزمەتی هەمان میوان گەیشتمەوە کە ناوی کاك (زاهیر) بوو، دوای سەلام و کەلام وتی: من لە ساڵی (١٩٩٣) نیوەڕۆیەك میوانی تۆ بووم لە سێیەم ڕۆژی جەژنی قورباندا، لە بیرت ماوە؟ وتم: باش لە بیرم نەماوە، وتی: ئەی خێزانت باسی هیچی نەکرد؟! وتم: نەخێر وەکو چی؟ وتی: باسی نان خواردن و نانی سەر سفرەکە؟ وتم: لێم نەبیستووە باسی هیچ بکا.

وتی: با بۆت بگێڕمەوە:

ماوەی چەند مانگێك بوو منداڵەکانم گۆشتیان نەخوارد بوو، پارەم نەبوو بۆیان بکڕم، زۆر دەست کورت بوم، بە نیاز بووم گۆشتی قوربانییمان بۆ بێت، بەڵام هەموو دراوسێکانمان یەکی پارچە گۆشتێکیان بۆ هات، کەچی ئێمە ناومان لە ناواندا نەبوو! ئەو جەژنە بێ گۆشت و بێ بەش لە خێری قوربانیی بەسەرمان برد، کە چاوم بەو گۆشت و سفرەیە کەوت، منداڵەکان و کوڕوزانەوەی منداڵەکانم هاتەوە بەرچاو، گۆشتەکەم بۆ نەخورا، پێدەچێت دوعای من بووبێت لە دەرگایان دابێت، کە تۆ چوویتە دەرەوە گۆشتەکەم بە ئێسقان و

پەراسووە برژاوەکانەوە لە نانێکەوە پێچاو خستمە گیرفانمەوە بۆ منداڵەکان، دوعام دەکرد ئێوە بە دوای ئێسقانەکاندا نەگەڕێن و لێیان نەکۆڵنەوە و ئاشکرا نەبێت، بۆیە کە لە ماڵی ئێوە دەرچووم بەو مژدە خۆشەوە چوومەوە بۆ لای منداڵە جگەرگۆشەکانم و ئەو مژدە و مزگێنییە خۆشەم لەگەڵ خۆم بە دیاریی بۆ بردنەوە، دە تو خوا ئێوەش گەردنم ئازاد بکەن، وتم: خۆزگە قسەت بکردایە، ئێمە چەند پارچە گۆشتی قوربانیی زیادمان هەبوو چەند پارچەیەکت بۆ ببردنایە، وتی: هەرچەندم کرد ڕووم نەهات!

# خوا کۆترەکەی خستە باوەشم

**مەلا داود کەپێشمەرگەی دێرینی یەکێتی بوو، ئێستا مەلایە لە گوندی جەیشانە وتی:**

ماوەیەکی زۆر لە گرانیی سەرەتای نەوەدەکاندا (١٩٩٣ ـ یان ـ ١٩٩٥) بە وردی نازانم کام ساڵەیان بوو، چەند مانگێك نەم دەتوانی مریشك، یان گۆشت، بکڕم، زۆر هەژار بووم و کار و کاسبیم نەبوو، حزبیش مەعاشی نەدەدامێ، چونکە وازم لێهێنابوو، زۆر نەدار و بار لار بووم، وتم: ئەمە تاقیکردنەوەی خوایە، سوێند بە خوا تەوبەکەم ناشکێنم.

هەموو ڕۆژێك بەسەر خەم و پەژارەی منداڵەکانم لە ماڵەوە و بێکاریی دەرەوە دەمناڵاند، کە دەچوومەوە بۆ ماڵ، منداڵەکان داوای گۆشت و مریشکیان لێدەکردم، پارەم نەبوو، ڕووی قەرزکردنیشم نەبوو، بێکار بووم و هیچ کار و کاسبیەکم دەستگیر نەدەبوو، بە ڕۆژ هەتا ئێوارە دەگەڕام کەس ڕووی کار و کاسبی تێنەدەکردم.

ڕۆژێکیان بەو دەرد و حەسرەت و خەم و پەژارە و دڵتەنگیەوە چوومە بەرخانەقای مەولانا خالید، لە چایخانەیەك دانیشتم لە ڕووی دەرەوە، بیرم لە پەرێشانیی حاڵ و ماڵی خۆم دەکردەوە، کتوپڕ کۆترێکی گەورەی جوان خۆی کرد بە باوەشم داو لەسەر ڕانم نیشتەوە، منیش وەکو داوم بۆ دانابێت و وەکو ڕاوچییەکی بەدەست و برد پەلامارم دایە و گرتم و وتم:

ئەم کۆترە هی کێیە؟ هی کەس نەبوو، کابرای چاپچی وتی: کورە بیدە بە منداڵێك تۆ ئەوەت بۆچی یە؟ وتم: ئەوە بە ڕاستە (لە دڵی خۆم دا وتم) بە خوا ئەوە خوای گەورە لەئاسمانەوە بۆ منداڵەکانی منی ناردووە، خێرا بردمەوە بۆ ماڵ و بۆم سەربڕین و خواردییان، ئەوەندە دڵم خۆش بوو کە منداڵەکانم گۆشتییان خوارد و ئاواتی چەند مانگەیان هاتە دی، نەمدەزانی چۆن سوپاس و پێزانی خۆم دەربڕم بۆ پەروەردگارم، وتم: کۆرپەکانم خوا ئێوە لە یاد ناکات، سوپاسی بکەن، ئێوەش لە یادی مەکەن.

با لێرەدا باسێکی تەقەی خۆشییتان بۆ بگێڕمەوە:

...کی خواناس و موسڵمان بۆی گێڕامەوە کە بە مەرەدی مەلا داود چوو بوو ، هەژارو نەدار و بێپارە و بێکار بووم، پارەی نیو کیلۆ گۆشتم نەبوو، کاریشم دەست نەدەکەوت، منداڵەکانم ماوەی سێ مانگ زیاتر دەبوو ڕۆژانە داوای گۆشتیان دەکرد و زۆر جار دەگریان و دەکڕوزانەوە، خۆشم گریانم بۆیان دەهات و جەرگم ژانی دەکرد، بەڵام چارم نەبوو گرانیی و برسێتیی و بێکاریی تا دەهات زیادی دەکرد و هەموو وڵاتی گرتبووەوە، نازانم چی ڕوویدا بوو خەڵکی بێکار و سك تێر دەستیان کرد بە تەقەی خۆشیی، هاتینە حەوشە بزانین ئەم تەقەی خۆشییە چیە؟ لە ناکاو مراوییەکی کێوییی لەبەردەمماندا دای بە زەویدا و تەپەی لێهەستا و دەستی کرد بە پەلەقاژە، خێرا لەگەڵ هاوسەرەکەمدا گرتمان و سەرمان بڕی، لەو کاتەدا دەنگی قاز و قولنگ دەهات لە ئاسماندا، منداڵەکانیش لە خۆشییدا خەریکبوو گەشکە بیانگرێ و کاتێك لە چاککردنی بووینەوە هەر بەوشەوە خستمانە سەر ئاگر، ئینجا تەقەی خۆشییمان بیر هاتەوە، کە هاتینەدەر تەقەی خۆشیی تەواو بوو بوو، وتم: (ئافرەت ئەم تەقەی خۆشییە هەر بۆ ئێمە بوو، بڕوا ناکەم هیچ ڕووی دابێت)، بۆیە ئێمە لە هەمووان زیاتر دڵمان خۆش بوو.

# شێتێکی پەککەوتە و دایکێکی دڵسۆز

کاک مەحمود هەڵەدنی کەئێستا لەژیاندایە وتی: لە گوندی هەڵەدن ئافرەتێك تەنها کوڕێکی شێتی هەبوو، دووبەدوو ژیانیان بەسەر دەبرد، کوڕەکە کەنەفت و داماو بوو، هەمو کات فاتمە خانی دایکی دوعای دەکردو لەخوا دەپاڕایەوە دەیووت: ( خوایە ئەگەر من مردم ، لە دوای من عوسمانی کوڕیشم بمرێ و زەلیل نەبێ ، کەس بۆی بەخێو ناکرێ ).

کوڕە شێتەکەیشی بەردەوام دوعای دەکرد و دەیوت: (خوایە دوعاکەی دایکم گیرا بکەی، ئەگەر ئەو مرد، یەکسەر منیش لە دوای ئەو بمرم، دایکم ڕاست دەکات بە خوا کەس منی پێ بەخێو ناکرێ).

خوای پەروەردگار دەستی بە ڕووی ئەو دایك و کوڕەوە نەنا، تەنها یەك شەو عوسمان لە دوای دایکی ژیاو یەکسەر مرد. فاتمە خان شەو سەعات نۆ مرد و خواحافیزی لە عوسمانی کوڕی کرد، بۆ سبەینێ دوای نوێژی شێوان بەبێ هیچ نەخۆشیی و ناتەواوییەك، هەر بە ساغی عوسمانی کوڕی بەلاداهات و مرد، هەردووکیان نزایان گیرا بوو و بە ئاواتی خۆیان گەیشتن.

# پاییزە برا

برایەکی خێرخواز خۆی بۆی گێڕامەوە، بە مەرجێك ناوی نەبەم، وتی: باری هەژاریی و دەستکورتیی پەردەی ڕەشی بەسەردا کێشام، براکەشم زۆر حاڵی باش بوو، خاوەنی چێشتخانە و کەبابخانەی خۆی بوو، ماڵ و خێزان و منداڵی زۆر پۆشتە و پەرداخ بوون، پۆشاکی گەرم و نەرم، خواردن و چەور و بەلەزەت، ماڵ و منداڵی پۆشتە و ئاسوودە، خێزان

و ماڵی منیش ڕووت و ڕەجاڵ و برسی، خۆیشم بێ کار و کاسبی و بێ پارە، حەزم نەدەکرد بچمەوە بۆ ماڵ و منداڵەکانم بە نائومێدییەوە سەیری دەستی بەتاڵ و هەناسەی ساردم بکەن، ئەگەر جارێکیش پارەیەکی کەمم دەستبکەوتایە دەبوو شتی هەرزان و خراپ بکڕم، هەتا بەشی ژەمێکی بکردایە.

لە هەمووی ناخۆشتر کرێچی برا گەورە بێ ڕەحمەکەم بووم، پارەی کرێ خانوم نەبوو، بە هەزار دەردی سەری هەتا کرێی خانووەکەم بۆ خاوەن ماڵ کۆ دەکردەوە و سەری مانگ دەمنایە مستی، ئەویش دەیخستە تەنگەی باخەڵیەوەو دەیووت: (بە زیاد بێ)، حاڵی من و خێزان و منداڵەکانیشمی باش دەزانی.

بەڕاستی گۆشتم بۆ نەدەکڕدرا بۆ منداڵەکانم، ناچار ئەو پەراسووانەی براکەم گۆشتی لێ داماڵیبون و بۆ جوانیی لە دەوروبەری کەبابەکە دایناوون داوام لێدەکرد پێم بفرۆشێ، ئەویش دەیزانی پارەم نییە، دەترسا پارەکەی نەدەمێ و بۆیە هەمو جار دەیووت: (ئەوە فرۆشراوە)، یان (وەعدم بە خەڵکی تر داوە)، ناچار بە هەناسەساردیی دەچوومەوە بۆ ماڵ، چونکە گۆشت گران بوو بۆم نەدەکردرا.

براکەشم کە دادەنیشتین سنگی دەردەپەڕاندو بەدیار من و ژن و منداڵەکانی منەوە دەستی دەکرد بەم قسانە:

دەیووت: ئەمڕۆ دەعوەتی کۆمەڵێك برادەرم کرد بۆ دوکان و بۆ فلان شوێن و فلان شوێن، دوو هەزاری سویسریی تێچوو، یان دوهەزار و پێنجسەد دیناری تێچوو، ئێمە زۆر خەفەتمان پێ دەخوارد، بەڵام خێزانەکەم زۆر چاك بوو —حەز دەکەم هەر بەلایەك بۆ ئەو هات ڕوو بکاتە من) زۆر دڵخۆشیی دەدامەوە، هەتا جارێك وتی: لەو دەشتەو لەو شوێنە ڕووخاوانە لەتە بلۆك و خشتی کۆن کۆدەکەمەوە، تۆ هەوڵی هەندێك داری دارەڕا بدەو لەو دەشت و چۆڵەوانییە قۆخەڵەیەك هەڵدەچنین، چووم بۆ سەردانی دایکم هەندێ داری دارەڕایان هەبوو، وتم: دایکە ئەو دارانەم بەهەرزان پێ بفرۆشە، وتی: کوڕم هەرزانی چی و کڕینی چی! بڕۆ بیانبە بۆ خۆت، وتم: لەسەر ئەو بانە بۆم دابنێ، بە پەلە ڕۆیشتم زۆر دڵخۆش بووم بەو دەسکەوتە ، ئەو هەواڵە خۆشەم بردەوە بۆ هاوسەرەکەم، چەند ڕۆژ بەو خەیاڵە خۆشەوە ڕامان بوارد ، دوای چوار پێنج ڕۆژ، لەوەدوا بە دڵێکی خۆشەوە چووم بۆ سەردانی دایکم و

دارەکان، کە چووم دارەکان نەمابوون، دوای سەلام کردن، خێرا وتم: دایکە کوا دارەکانم؟ وتی: (ڕۆڵە بە خوا دەستم شکێ کاکت دارەکانی دزی)! ئیتر برینی کۆن و نوێم کولایەوە، بە دڵێکی پڕ غەمەوە ڕۆیشتم بە کاکم وت: بۆ دارەکانی منت برد؟ وتی: جا تۆ چیت هەیە؟ دینارێك شك نابەی دارت بۆ چیە؟ (بە فیزێکەوە)، ڕۆژ هات و ڕۆژ ڕۆی، وردە وردە دەستم لە کار و کاسبی گیر بوو، دوای پێنج ساڵ هەندێك پارەم کۆکردەوە، لە عەربەت خانوویەکی دارم کڕی، دوای مامەڵە و پارە تەسلیم کردن، کابرا وتی: کاك فلان، شتێکی سەیر! وتم: چی بووە؟ وتی: داری ئەم خانووە داری خۆتان بوو لە کاکەتم کڕی، (ئەو دارانە بوو کە دایکم بە خۆڕایی دای پێم و کاکم لێی دزیم)، دوای پێنج ساڵ بە دارە زەوتکراوەکانم شاد بوومەوە، بەلام بە کڕین!.

ئێستاش کە ئەم بەسەرهاتە بۆ جەنابت دەگێڕمەوە، برا گەورەکەم هەژار کەوتووە و هیچی نەماوە و کاسبیشی نییە، بەڵێ برا دەوڵەمەندەکەم هەژار کەوتووە و کرێچی منە، بەلام دڵم ڕێگە نادات کرێی لێوەرگرم و هەتا ئێستاش کرێم لێوەرنەگرتووە و یەك وشە و یەك پیتم لە کارەساتەکانی ڕابردوو بە ڕوویدا نەداوەتەوە.

## برادەرە عەرەبەکانم چەکیان بۆ تەنگانە بوو

مەلا غەریب لە زاری خۆیەوە بیستراوە کە لەسەردەمی بەعسی لە گۆڕنراو سەرباز بووە، لە گوندی (شاراژاو)ی نزیکی سەراو، لەوێ لەگەڵ عەریفێکدا دەبێتە شەڕیان و ئەم زۆر چاك عەریفەکە دەکوتێ، لە ئەنجامی ئەو شەڕەدا نەقڵی حاجی ئۆمەران دەگوازرێتەوە، ئەو ئێوارەیەی دەگاتە حاجی ئۆمەران ڕەوانەی بەرەکانی جەنگی دەکەن، هەمان شەو ئێران هێرش دەکاتە سەر هێزەکانی عێراق و شالاویان بۆ دێنێ، لەسەر قسەی خۆی نزیکەی (٣٤) کەس ڕزگاریان دەبێت لەو لەشکرکێشی و هێرشەی ئێران دا یەکێکیان، مەلا غەریب، قارەمان دەبێت.

دەڵێ کە گەڕاینە دواوە بەماندوویی و شەکەتیی و برسێتیی، هەمووشمان چەکدار بووین، لە دوورەوە چەند کەسێکمان بینی لە سەیارەیەکدا بوون، برادەرەکانی منیش کە هەموویان عەرەب بوون، وتیان ئەوە لیژنەی ئیعدامن، بە خودا ڕزگارمان نابێ، قسەکەیان ڕاست بوو، کە جێبەکە گەیشتە لای ئێمە بانگیان کردین و پرسیاریان لێکردین کە: ئێوە چین و بۆ کوێ دەچن؟ ئێمەش بەسەرهاتەکەمان بۆ گێڕانەوە وتیان: وەرنە لای ئەو دیوارە، (پارچە دیوارێکی ڕێك لەوێ دابوو)، ئێمەیان لەودیو دیوارەکەوە ڕیز کرد بەدوو ڕیز، خۆشیان دوو ئەفسەر و نائب زابتێك بوون پشتیان لە دیوارەکە کردوو ڕووبەڕووی ئێمە وەستان، دواتر ورتەورتێکیان کرد و ئێمەیان کردە یەك ڕیزی درێژ، هەمووشمان تفەنگمان بە شانەوە بوو، من زووتر تفەنگەکەی خۆم هێنابووە سەر پێ و لەسەر ڕیز (صەلیە) دامنابوو، ئەفسەرێکیان هات لە یەکەم کەسەوە لێی پرسی ناوت چیە؟ دوای وەڵامدانەوە چەکەکەیان لە شان دادەماڵی و دەیدا بەدەست نائب زابتەکە، ئەویش دەیبردە ئەودیو دیوارەکە و فیشەکێك، یان دوانی پێوە دەنا و بەجێی دەهێشت و دەهاتەوە بۆ یەکێکی دیکە.

مەلا غەریب لە ڕیزەکەدا نۆهەم کەس دەبێ، زۆر جەریەزەو زەبر بەدەست و دەست وەشێن بوو، دەڵێ نائب عەریفێکی عەرەب لە تەنیشتمەوە بوو، هەشتەم کەس بوو، بڕیارماندا دەست بکەینەوە، وا ڕێکەوتین کە سەرە گەیشتە سەری پێکەوە دەست بکەینەوە، بەڵام کاتێك ئەفسەرەکە هاتە بەردەمی و ناوی لێ پرسی و داوای چەکەکەی لێ کرد، وتی: (نعم سيدي)، شانی بۆ خوار کردەوەو چەکەکەی تەسلیم کرد، ئیتر سەرە گەیشتە سەر من و چەکەکەشم لەسەر سەلیە بوو، ئەویان برد بۆ پاش دیوارەکە، ئەفسەرەکە هاتە بەردەمم، وتی: ناوت چیە؟ وتم: غەریب، ئەویش دەمانچەیەکی ڕوتی بەدەستەوە بوو، دەبوو زۆر وریایانە دەست بکەمەوە، وتی: چەکەکەتم بدەرێ، وتم: (نعم سيدي)، چەکەم داگرتوو لەگەڵ داگرتنەکەدا دەستم لێ کێشا و پەنجەم لە بەلەپیتکەکەی قایم کرد و هەر سێ فیشەکەکەم پێوەنان و هەردوو ئەفسەرەکەم کوشت و کاکی نائب زابت لە پاش دیوارەکە هاتە دەر ویستی بمکوژێ، منیش دەستم برد بۆ هێدەکێکی تر بە بەر پشتێنمەوە بوو، هەر چەندم کرد نەهات بەدەستمەوە، ناچار ڕام کرد، ئەویش بە تەقە کردن دوام کەوت، گولەی زۆری

پێوەنام، بەرم نەکەوت، هەتاخۆم دایە پاڵ بەردێك و هەر چۆن بوو مەخزەنەکەم لێکردەوەو خستمە سەر تفەنگەکە و ئەویشم کوشت، کە کوناو کون بە شوێنمەوە بوو، ئینجا بەدەستوبرد گەڕامەوە بۆ لای هاوڕێکانم، سوێندتان لەسەرم نییە یەك کەسیان لە شوێنی خۆی نەجوڵابوو، یەك کەسیان نەیوێرابوو دەست ببات بۆ تفەنگەکەی، کە هاتمەوە ڕیزەکەم لێ تێکدان و گلەییم لێکردن، بۆ کە کابرا خەریك بوو من بکوژێ دەستتان نەکردەوە؟ هیچ وەڵامێکیان پێنەبوو، وتیان: تۆ گەورە و لێپرسراومان بە، چی دەڵێیت لە خزمەتتداین، وتم: بە خۆڕاییش خزمەتکاری وام ناوێت، چونکە ئەوەندە ترسنۆك و جولەکە سیفەت و نامەردن، بڕۆن وازم لێبێنن، با هەمووتان نەکوژم، بەهەرحاڵ ڕزگارم بوو، دوای چەندەها چەرمەسەری و دوای چەند ناڕەحەتیی و گێروگرفت گەیشتمەوە ناوچەی خۆمان (شارەزوور).

## خوا لە کەس غافڵ نییە

**لە زاری مامۆستا مەلا مەحمودی ئازادییەوە بیستوومە کە خۆی لە کابرای بینیوە و چووتە سەردانی:**

لە ناوچەی پێنجوێن و لە گوندی بەیانە- (نزیك گوندی ئاروزەری شارباژێڕ) مامۆستایەکم بینی مۆڵەتی زانستیی لە ئێران وەرگرتبوو لە ناوچەی موکریان، ساڵی (١٩٥٥) هاتبووە بەیانە بۆ مەلایەتی، بەڵام دوای ماوەیەکی کەم تووشی ئیفلیجیی دەبێت و ئەندامەکانی جەستەی لە جموجۆڵ دەکەوێ و وەکو لاشەیەکی بێگیانی لێ دێ، ژن و ماڵیشی نابێ، خزم و کەس و کاریشی هەواڵی نازانن، یان هەر گوێی خۆیانی لێ دەخەوێنن، لەم گوندەدا (بەیانە) ژنێك هەبوو، دوو منداڵی هەبوو خۆی تەرخان کردبوو بۆ خزمەتی ئەو مامۆستا بێکەسە، وەکو منداڵەکانی خۆی پاکی دەکردەوە و دای دەشۆرد و جلوبەرگ و پۆشاك و لەشی بۆ دەشۆرد، خواردنی بەدەمەوە دەکرد و جلی بۆ دەگۆڕی.

مامۆستا مەلا مەحمودی ئازادیی، فەرمووی: ساڵی (١٩٦٧) چوومە سەردانی ئەو مامۆستایەی گوندی بەیانە، ئەو خوشکە خێرۆمەندە لەوێ بوو، لێی پرسیم وتی: مامۆستا خەڵکی ئەم گوندە باش و خێرەوەمەند نین، وتم: بۆچی؟ وتی: ئەم مامۆستایەیان ئاوا وێڵ کردووە و کەس گوێی ناداتێ، بەڵام من لەبەر خوا خۆم تەرخان کردووە بۆ خزمەتی، وەکو منداڵەکانی خۆم دای دەشۆم وپاکی دەکەمەوە و خواردنی بەدەمەوە دەکەم و جلوبەرگی لەشی بۆ دەشۆم، خەڵکی ئەم گوندە دەڵێن حەرامە و دروست نییە، ئەم پیاوە نامەحرەمە و هیچ خێرت ناگات، بەڵکو لەوانەیە گوناهیشت بگات، جا نازانم جەنابت چی دەڵێی؟ وتم: خوشکە بەڕێزەکەم تۆ بەهەشتت دەستگیر بووە لە دەست خۆتی مەدە و ئەو کارە ئەوەندە خێرە خوای گەورە کەسی تایبەتی و ناوازەی بۆ هەڵدەبژێرێ، گوێ بۆ کەس مەگرە و لەبەر ڕەزامەندیی خوا هەتا دەتوانی خزمەتی بکە، پاشان ڕووم کردە مامۆستای ئیفلیج و وتم: جەنابی مامۆستا ژن وماڵت نییە؟ وتی: نەخێر، وتم: چەند ساڵە تووشی ئەم گرفتاریە بوویت؟ وتی: مامۆستا زۆر نییە، بەخششی خوایە، وتم: چەندەیە؟ وتی: هیچ نییە، مامۆستا یازدە ساڵە! هەتا چەند ساڵی تریش هەواڵم دەزانی هەر وابوو.

## هەردووکیان

## بە خەتەنەکراوی لە دایک بوون

**کاک سالم تۆفیق بۆی گێڕامەوە و وتی:**

خوشکێکی خێزانەکەم دوو کوڕیان دوابەدوای یەك بوو، هەردووکیان بە خەتەنەکراوی لە دایك بوون، بە ناوەکانی (ڕێبەر و شاد)، هەر دوو منداڵەکە ماون و خەڵکێکی زۆریش ئاگاداری ئەم ڕووداوە سەرسوڕهێنەرە بوون لە شاری (سلێمانی) لە نزیك ئەسحابە سپی، یان گەڕەکی سابونکەران، لە نزیك ساڵەکانی (١٩٩٩ ـ ٢٠٠١)، ئەم ڕووداوە سەیر و سەمەرەیە بینراوە.

# لەخزمەت پێشەوای وەفاداراندا

پێغەمبەری خوا (سەڵات و سەلامی خوای لەسەر بێت) پێشەوا و سەرمەشق و سەرقافڵە و ڕچەشکێنی وەفادارانە، بە تایبەتی نموونە و ڕەمزی هاوسەری وەفادارە لە مێژووی وەفادارییدا.

ئەگەر ئادەم (سەلامی خوای لێبێت) هاوسەرەکەی لە خۆی دروستکراوە و بەشێك بوو لە جەستەی خۆی، ئەوا پێغەمبەری خوا هەندێك لە هاوسەرانی تەنانەت کچی دوژمنەکانی بوون و خەزورەکانی بۆی لە کەمیندا بوون و سەنگەریان لێگرتبوو.

ئەگەر نوح (سەلامی خوای لێبێت) نۆسەدوپەنجا ساڵ پێغەمبەر بووە و هاوسەری بێبڕوای هەبووە و هیچ گوفتار و کردارێکی ناشایستەی ئاراستە نەکردووە و لە گوڵ کاڵتری بە ژنەکەی و کەسوکارەکەیشی نەوتووە، ئەوا پێغەمبەری ئیسلامیش یازدە ژن، یان زیاتری هێناوە و لە یەککاتتدا لەگەڵ نۆیان ژیانی بەسەر بردووە و یەك وشە و هێمای لەبەرامبەریاندا نەنواندووە کە لە دانەی گەوهەر جوانتر و لە پەڕەی گوڵ ناسکتر و لە دوڕ و مرواری سەنگینتر نەبووبێت.

چەند بەڕێز و شکۆوە باسی دایکی موسڵمانان، خەدیجەی خێزانی دەکرد؟!، چۆن دوای مردنیشی نزا و پاڕانەوەی بۆ دەکرد؟! چۆن بەرانی شاخدار و مەڕ و بزنی قەڵەوی بۆ دەکردە خێر و سەدەقە.

بڕوانە پێغەمبەر (سەڵات و سەلامی خوای لەسەر بێت) چۆن بە قەسابەکەی دەفەرموێ: هەندێ گۆشتی نەرمەم بۆ جیا بکەرەوە بۆ فڵانە پیرەژن، وتیان: بۆچی بە تایبەتی بۆ ئەو پیرەژنە؟ فەرمووی: چونکە لەسەردەمی خەدیجەدا هاتوچۆی دەکردین.

چۆن ڕێزی تایبەتی دەگرت لە فڵانە پیرەژن و فڵانە ئافرەت، چونکە هاوڕێی خەدیجەی هاوسەری بوون، ئەوە (ئەبولعاس)ی زاوایەتی کە هاوسەری زەینەبی کچیەتی، لە جەنگی بەدردا بەدیل گیراوەو وەکو دیلەکانی تر داوای فیدیەی لێ دەکرێ، ئەویش چاوەڕێیە کەسوکاری پارە و ماڵ و سامان بهێنن و بەرەڵای بکەن و بیبەنەوە لەگەڵ خۆیان، بەڵام کەسوکاری بێ دین و بتپەرست و ئارەقخۆر و سەرمەست ئەویان هەر لە بیر نییە، بۆیە زەینەبی هاوسەری (خوای لێ ڕازی بێت) ئەو ملوانکەیەی پێچایەوە، کە چەند ساڵێك لەوەوپێش خەدیجەی دایکی لە شەوی گواستنەوەیدا بەدیاری پێی بەخشی بوو، بە کەسێکدا

ناردی بۆ پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێتت) هەتا بەو ئاڵتونە هاوسەرەکەی بۆ ئازاد بکەن.

کاتێك کابرا هاتە خزمەت پێغەمبەر و قوماشە پێچراوەکەی دایە دەستی و خەڵکی پێیان سەیر بوو، یەکێك تووڕە و یەکێك دەم بە زەردەخەنە، چۆن دیلێ بەم پریاسکەیە بەرەڵا دەکرێ، بەڵام کاتێك پێغەمبەر (سەڵات و سەلامی خوای لەسەر) بە دەستە پیرۆزەکانی پریاسکەکەی کردەوە، ملوانکەکەی ناسییەوە، خەیجەی هاوسەری بیرکەوتەوە، هەردوو چاوی پڕبوون لە گریان و فرمێسکیان داباراند و فەرمووی: ئەمە فیدیەی زەینەبی کچمە بۆ ڕزگار کردنی (ئەبولعاس)ی ناردووە، داواتان لێدەکەم بۆی بەربدەن و ملوانکەکەیشی بۆ بنێرنەوە!

دایکی ئیمان داران عائشە (خوا لێی ڕازی بێت) دەفەرموێ: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) ئەوەندە باسی خەدیجەی کرد هەتا غیرە گرتمی و خۆم پێ نەگیرا، وتم: ئەم پیرەژنە چیە تۆ ئەوەندە باسی دەکەی؟ ئەو مرد و ڕۆژگار لە بیری بردینەوە و خوا بۆی گۆڕیت بە کچی گەنج و جوان، بینیم پێغەمبەری خوا پێی ناخۆش بوو، فەرمووی: نەخێر هەر ئەو چاکتر بوو.

چەند جار لە فەرموودەی سەحیحدا هاتووە کە خێزانەکانی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویانە: هەرگیز پێغەمبەر لە کەسمانی نەداوەو قسەی نابەجێ وجوێنی بەکەسمان نەداوە، وەلەکاتی نەخۆشیی و بێ نوێژی و حاڵەتی نائاساییدا و لە کاتی تووڕەبوون و خەفەتبارییاندا دەم بە خەندە و کەیف خۆش بووە و دڵخۆشیی داونەتەوە، نیوە پاروی دەمی ئەوانی خواردووە و لە پەرداخ و جێگەی دەمی ئەواندا ئاوی خواردۆتەوە، لە کاتێکیشدا هەستی کردبێ یەکێکیان دڵتەنگە و پەژارە دایگرتووە، دەستی خستۆتە سەر شانی و فەرموویەتی: تۆ لە بەهەشتیشدا هاوسەری منی، بەم فەرموودەیەش زیاتر لە مەبەستێکی هەبوو، واتە: تۆ ئەهلی بەهەشتیت و لە بەهەشتیشدا لەگەڵ منیت و هەرگیز لە دونیاشدا نیازم نییە لێت جیا ببمەوە، چونکە تۆم خۆش دەوێ، مژدەیشە بۆ ئەو هاوسەرەی کە بە ئیمانەوە دەمرێ، هەروەها بە هیچ جۆرێك مۆڵەتی نەداوە کە بە شێوەی ناشایستە یەکێکیان باسی ئەوی تریان بکات.

دیمەنێکی تری وەفاداریی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر) بۆ هاوسەرەکانی ئەوە بووە کە زۆر ڕێزی لە خزم و کەسوکاریان گرتووە و بە چاك باسی کردوون و دەستی ڕێز و نەوازشی بۆ ڕاخستوون.

بەڵێ، لە زۆر بواردا پرسی بە هاوسەرەکانیشی کردووە و بە گوێی کردوون و ڕێزی لە بیر و بۆچوونیان گرتووە، لە گەورەترین ڕێکەوتننامەدا (سوڵحی حودەیبیە) لە مێژوی ئیسلامدا پرسی بە ئوم سەلەمەی هاوسەری کردو بەگوێشی کرد و ڕا و بۆچوونەکەیشی زۆر سەرکەوتوو بوو، تەنانەت هەر لە ژیانی خۆیدا و لە پێش وەفاتیدا، بە ئایەتی قورئان مژدەی پێداون، کە ئێوە بۆ هیچ کەس دروست نین و نابێ شوو بە کەس بکەنەوە، ئێوە ئیتر دایکی ئیماندارانن، لە دونیا و دوارۆژدا من هاوسەرتانم و حەز بە هاوسەرییتان دەکەم و لە کەستان وەڕس نیم.

ڕۆژێك ڕووی کردە هاوەڵانی و فەرمووی: چاکترینتان چاکترینتانە لەگەڵ هاوسەریدا و من چاکترینتانم لەگەڵ هاوسەرانمدا.

ئامۆژگاریی هاوەڵانی دەکرد بەم وتە شیرین و ناسك و پڕ مانایە: (رفقا بالقوارير)، واتە: نەرمونیان و دڵنەرم بن لەگەڵ شووشە ناسکەکان دا.

# شەوگەردی بەوەفا

بەسەرهاتی قەشەیەکی زانایە کە سەرگەرمی لێکۆڵینەوەیەك بوو دواتر بەو شێوەیە موسوڵمان بووە، بەسەرهاتەکەش لە ئینتەرنێتەوە وەرگیراوە و لە نووسراوەکانی (ئەندازیار عوسمان)دا باسەکەی هاتووە:

ماوەیەکی زۆر لە بیرکردنەوەدا بووم، خەیاڵ و ئەندێشە و هەست و نەستم غەرقی بیرکردنەوە بوو دەربارەی بابەتێکی زانستیی زۆر گرنگ، ڕۆژانە دەچوومە دەرەوە و بەدەم پیاسەکردنەوە بیرم دەکردەوە، دەڕۆیشتم بە لای کۆمەڵێ وەستا و کرێکاردا گوزەرم دەکرد و کەسێکیش لەوان ڕادەما.

هەتا ڕۆژێکیشیان لە کاتی دانانی بلۆکێکدا لە لایەن وەستاکەوە بینیم شەوگەردێك (قۆریلەیەکی بچووك) لە بۆشایی بلۆکەکەدا گیری خوارد و ڕێگەی هاتنە دەرەوەی نەبوو، دیمەنی ئەو شەوگەردە بەندکراوە لە خەیاڵمدا دەرنەدەچوو، بۆیە هەر کات لەو شوێنەوە بڕۆیشتمایە، لە کونی بلۆکەکەوە شەوگەردی گیرخواردوم بەسەردەکردەوە و هاوخەمیی و

هاوده‌ردیی خۆمم بۆ ده‌رده‌بڕیی، هه‌تا دوای شه‌ش مانگ له‌ کاتی تێپه‌ڕبوونم به‌ لای ئه‌و شوێنه‌دا هات به‌ دڵمدا بزانم ئه‌م شه‌وگه‌رده‌ به‌سته‌زمانه‌ چی ده‌خوات، خۆ من له‌ کاتی سه‌ردانم دا بۆ لای هیچ دیارییه‌کم بۆ نه‌بردووه‌، ده‌بێ چی خواردبێ؟ بۆیه‌ هه‌ڵوێسته‌یه‌کی درێژ و پشوویه‌کی خه‌یاڵاوییم داو له‌ دووره‌وه‌ زۆر به‌ وردیی سه‌رنجی ئه‌و کونه‌ بلۆکه‌م ئه‌دا که‌ شه‌وگه‌رده‌که‌ به‌رده‌وام له‌ ده‌لاقه‌ی بلۆکه‌که‌وه‌ سه‌یری ده‌ره‌وه‌ی ده‌کرد، له‌ ناکاو شتێکی سه‌رسوڕهێنه‌رم بینی که‌ بووه‌ یه‌که‌م هه‌نگاو و به‌ردی بناغه‌ی موسڵمانبوونم و باوه‌ڕهێنانم.

چیم بینی؟ ئێستاش هه‌موو جار بیر له‌و دیمه‌نه‌ ناوازه‌یه‌ ده‌که‌مه‌وه‌، به‌ خه‌یاڵ ده‌گه‌ڕێمه‌وه‌ بۆ لای شه‌وگه‌ردی به‌ندکراوی هاوڕێم، بینیم شه‌وگه‌ردێکی هاوشێوه‌ی خۆی، مێشووله‌ و نێچیری ڕاو ده‌کرد، منیش له‌ دڵی خۆمدا ده‌مووت: به‌ هه‌ناسه‌یه‌کی سارده‌وه‌، خۆزگه‌ ئه‌و شه‌وگه‌رده‌ش ئاوا ئازاد بووایه‌ و ڕاوی بکردایه‌ و بای باڵی خۆی بدایه‌، ئه‌وه‌ی به‌ بیرمدا نه‌ده‌هات به‌ چاوی خۆم بینیم! به‌ چاوی خۆم دیم شه‌وگه‌ردی ڕاوچی نمه‌کی نێچیره‌که‌ی نه‌ده‌کرد و به‌ساغی و به‌ ئه‌مانه‌ته‌وه‌ ده‌یهێنا و له‌ کونی بلۆکه‌که‌وه‌ ته‌سلیمی شه‌وگه‌رده‌ به‌ندکراوه‌که‌ی ده‌کرد، زۆر سه‌رسام بووم به‌م کاره‌ دڵسۆزانه‌یه‌ی ئه‌م گیانداره‌ به‌سته‌زمانه‌، به‌ڵام ئه‌وه‌ی زیاتر سه‌رنجی ڕاکێشام و سه‌رسامی، کردم جۆری ئه‌و په‌یوه‌ندیه‌ نهێنییه‌ بوو که‌ له‌ نێوان ئه‌و دوو شه‌وگه‌رده‌ عاشق و مه‌عشوقه‌دا بوو!

ده‌زانن په‌یوه‌ندی ئه‌م دوو دڵسۆز و خۆشه‌ویست و وه‌فاداره‌ چی بوو؟.. دوای لێکۆڵینه‌وه‌ بۆم ده‌رکه‌وت ئه‌م دوو شه‌وگه‌رده‌ نێره‌ و مێینه‌ و هاوسه‌ری یه‌کترن، ئه‌ویان که‌ له‌ به‌ندیخانه‌دایه‌ نێره‌ و ئه‌وی تریشیان مێیه‌ و هاوسه‌ری وه‌فاداریه‌تی.

به‌ ڕاستی ئه‌م دیمه‌نه‌ دڵفڕێنه‌ و هه‌ڵوێستی ئه‌و شه‌وگه‌رده‌ مێینه‌یه‌ ویژدان و هه‌ست و ده‌روونی هه‌ژاندم، یه‌کسه‌ر بیرم له‌وه‌ کرده‌وه‌، ئایا ده‌بێ دوو هاوسه‌ری ئاوا به‌وه‌فا و به‌ئه‌مه‌ك له‌ ناو ئاده‌میزاده‌کاندا ده‌ست بکه‌وێ؟! حه‌تمه‌ن.

دوای بینینی ئه‌م دیمه‌نه‌ ناوازه‌یه‌ له‌ دونیای وه‌فادارییدا، ده‌ستم کرد به‌ لێکۆڵینه‌وه‌ و توێژینه‌وه‌ی دینه‌ ئاسمانییه‌کان، بۆ یه‌که‌م جار کتێبێکم ده‌ست که‌وت ده‌رباره‌ی ژیانی پێغه‌مبه‌ری ئیسلام و له‌گه‌ڵ کردنه‌وه‌ی کتێبه‌که‌دا ئه‌م ڕووداوه‌م به‌رچاو که‌وت:

پێغه‌مبه‌ری خوا (سه‌ڵات و سه‌لامی خوای له‌سه‌ر بێت) له‌ ماڵه‌وه‌ دانیشتبوو له‌گه‌ڵ چه‌ند ئه‌ندامێکی خانه‌واده‌که‌یدا، له‌ ناکاو له‌ ده‌رگا درا، ئافره‌تێکی کامڵ له‌گه‌ڵ له‌ ده‌رگاداندا فه‌رمووی: (ألسلام عليكم أأدخل؟)، پێغه‌مبه‌ری خوا هه‌ر گوێی له‌م ده‌نگه‌بوو ده‌ستبه‌جێ

هەستایە سەر پێ و فەرمووی: دەنگی خەدیجەم گوێ لێبوو (کە ئەو کاتە نزیکەی حەوت ساڵ بوو وەفاتی کردبوو) ئەوانەی لەوێ بوون لەم فەرمایشتەی پێغەمبەر سەرسام بوون.
فەرمووی بیکەنەوە، کە دەرگایان کردەوە هالەی خوشکی خاتوو خەدیجە بوو، پێغەمبەری خوا (درووودی لەسەر بێ) بەرەوپیری ڕۆیشت و بەخێرهاتنی کرد و فەرمووی: وتم دەنگی خەدیجە دێ! ! ئینجا عەباکەی خۆی بۆ ڕاخست و لەسەر عەباکە دایینیشاند، ئەوە خوشکی خەدیجە بوو بۆیە ئاوا ڕێزی لێگرت، وەك وەفادارییەك بۆ خاتوو خەدیجەی هاوسەری کۆچکردووی.
دەڵێ وتم: شەوگەرد مامۆستای هەبووە لە وەفادارییدا، بەڕاستی ئەوانیش لە پێغەمبەری ئیسلامەوە فێری وەفاداریی بوون، ئیتر یەکەم هەنگاوم نا بەرەو ئیسلام و شایەتمانم هێنا و ئێستا زۆر بەختیارم و زۆریش شانازیی دەکەم کە موسڵمانم.
وەفاداری سیفەتی پێغەمبەران بوو بە درێژایی مێژووی مرۆڤایەتیی، بە تایبەتیش سەرداری پێغەمبەران، موحەممەد (سەلامی خوای لەسەر بێت) فەرمانی کردووە بە وەفاداری، تەنانەت لەگەڵ کافر و بێباوەڕ و بتپەرست و دوژمنی دین و دنیاماندا، هەرکەسیش ژیاننامەکەی بە وردیی بخوێنێتەوە وەك ڕۆژی ڕووناك دەبینێت، کە سەرتاپای ژیانی وەفاداریی و فەرمان کردن بەوەفاداریی بووە، وەفاداریی لەگەڵ خوا، لەگەڵ پێغەمبەران، لەگەڵ دایك و باوك و مامۆستا و هاوڕێ و دراوسێ و قوتابی و شاگرد و خزم و هاوسەر و ناسیاو و دۆست و خۆشەویستان، وەفاداریی لەگەڵ دوژمن لەگەڵ نەیار و تەنانەت خیانەتکار و ناپاکانیش، وەکو دەفەرموێت: (ولا تخن من خانك)، ناپاکیی لەو کەسانەش مەکەن کە ناپاکییتان دەرباره دەکەن.
وەفاداریی لەگەڵ ئاژەڵ و باڵندە و گیانلەبەر و تەنانەت دار و بەرد و کارێز و کانی و سەرچاوەکانیش، هەموو ئەم حاڵەتانەش لە فەرموودە و سوننەتدا هێمایان پێکراوە و خەڵکی موسڵمانیان بۆ هان دراوە و وەك خواپەرستیی بۆیان دیارییکراوە و دەبێ خوای پێ ڕازی بکەن.
سەدان دەقی قورئان و سوننەت باسی وەفاداریی دەکەن و فەرمان بە هەموو جۆرەکانی دەکەن.

# دوای چل و شەش ساڵ دابڕان

# بوونەوە بە ژن و میردی ڕاستەقینە

حاجی عەلی دانیشتووی گوندی (دەرەتفێ)ی مەریوان لە کوردستانی ڕۆژهەڵات، بە هۆی کەم شارەزاییان لە فەلسەفە و ناوەڕۆکی زەواج و تێنەگەیشتنیان لە ئامانج و مەبەست و چێژ و سۆزی هاوسەرێتیی، لەگەڵ ژنەکەیدا لێك دادەبڕێن و پێکنایەنەوە، حاجی عەلی لە سلێمانی نیشتەجێ دەبێت و هاوسەرەکەشی لە مەریوان، بەبێ تەڵاق و جیابوونەوەی شەرعیی و یاسایی، وەك دەڵێن: (من لە دووری و تۆ لە دووری) بۆ ماوەی چل ساڵ دەمێننەوە!

حاجی عەلی ژنێکی تر دێنێ و هاوسەرە دوورەکەشی لە ماڵە باوانی بە غەریبیی دەمێنێتەوە، نە داوای تەڵاق دەکا و نە باسی شووکردنیش دەکا، دوای چل و شەش ساڵ حاجی عەلی بێ ژن دەکەوێت و هاوسەرە تازەکەی دەمرێ! لەوەدوا مامۆستا مەلا مەحمودی ئازادیی دەکەوێتە نێوان حاجی عەلی و هاوسەرەکەی (ئەوەی کە لە مەریوانە) و ئامۆژگاریی زۆریان دەکات و قەناعەتیان پێدەکا کە هەردوولا ئاشت ببنەوە و گەردنی یەکتر ئازاد بکەن و ببنەوە بە هاوسەری ڕاستەقینەی یەکتر، بەڵێ دوای چل و شەش ساڵ لە دابڕان و دوورکەوتنەوە، ترووسکەی ئیمانەکەیان سەرلەنوێ گەشایەوە و سۆز و بەزەیی و خۆشەویستی هاوسەرێتیی بەیەکی گەیاندنەوە و چەند دۆستێك چوونە مەریوان و هاوسەری حاجی عەلیان هێنایەوە بۆ ئەو ماڵەی چل و شەش ساڵ لەوەوپێش بەجێی هێشتووەو لەگەڵ حاجی عەلی لێکدابڕان، ئەو ماڵەی بە تۆبووکی و زاوایی لێك دابڕان، ئێستا بە کامڵیی و برا پیری هاتنەوە و ماڵەکەیان ئاوەدان کردەوە و کاسەی ئاشتی و ڕەشماڵی خۆشی جارێکی تر بووە میوانیان و سێبەری خۆشی و شادی و شنەبای هاوسەرێتی شەرعی، دەست و دەم و دڵ و دەروون و گیانی ئاسوودە کردن و دوای چەند ساڵ دووریی و خەم خواردن و

فرمێسك ڕشتن و هەناسەی سارد و گڕی دەروون لە شاری سلێمانی سێ ساڵی پڕ خۆشی و ئاشتی و خۆشەویستیان بردە سەر.

ئینجا بە گەردن ئازادی خۆشەویستی و باخی پڕ بەختیاریی و خونچە گوڵی تازە پشکووتوو، تەمەنیان بەڕێ کرد.

حاجی عەلی بەدڵێکی پڕ خەم و پەژارەوە تەرمی هاوسەری نایە سەر شانی و هەزار جار گەردنی ئازاد کرد و هەروەکو تەنها سێ ساڵ ئەم هاوسەرگیرییەی لەگەڵ گرتبێ و ئەم کوڕێکی گەنج و تازە زاوا بێ، هاوسەریشی تازە بووك و لە هەڕەتی گەنجی و جوانییدا بوو‌بێت، ئا بەو جۆرە بۆی لە غەم و پەژارەدا بوو، ئەو سێ ساڵە بووە باخی پڕ بەر و گوڵزاری پڕ لە گوڵ و پاییزی ژیانی هەردووکیان بوو.

ئەوا دەبینی حاجی عەلی لەسەر تەرمەکەی، فرمێسکی چل و شەش ساڵیی، وەك ڕێژنەی باران بە چاوانی دا دێنە خوار و نزا و پاڕانەوەی بەکوڵی بۆ دەکات.

ئاواش دەبینی دەوری ئاشتەوایی و ئاشتیخوازیی و خەمخۆریی زاناکانی گەلەکەمان وەکو تیشك و گزنگی زێڕینی خۆر بەناخی کۆمەڵگەو شیو و دۆڵ و لادێ و گوندە دوورەدەستەکان و شار و شارۆچکە و قوڵایی دڵی خەڵکی دا ڕۆچووە، دڵە غەمبار و کۆست کەوتووەکان وەکو گوڵی بەهار دەگەشێننەوە، هەتا دەخرێنە گۆڕ، کۆڵی خەمی خەڵکی لە کۆڵ دەگرن و ئاخ و داخ لە گرفت و کێشەی خەڵکیی هەڵدەکێشن، خەڵکیش بە مردنی ئەو زانا خەمخۆرانە کۆستیان دەکەوێت.

# شانزه ساڵ ژنەکەی لە نەخۆشخانە لە ژێر چاودێریی پزیشکدا بوو. پێی لێ نەبڕی

**شێخ موحەممەد حەسسان (خوا تەمەنی درێژ و پڕ خێرتر بکات)، فەرمووی:**

کەسێك دەناسم شازدە ساڵە ژنەکەی دووچاری نەخۆشیەك بووە و پزیشکە تایبەتیەکەی دەڵێ: نابێ لە خەستەخانە دەرچێت، بەڵکو دەبێ بیست و چوار سەعات و ساڵ دوانزە مانگە لەژێر چاودێریی پزیشکدا بێت، سات لەدوای سات چاوەڕێی چاك بوونەوەی دەکەن.

لێرەدا شێخ موحەممەد حەسسان باسی لە وەفاداریی و بەئەمەکیی هاوسەری ئەو ئافرەتە نەخۆشە بوو، کە لە ماوەی ئەو شانزە ساڵەدا ئێوارەو بەیانی سەردانی هاوسەرەکەی کردووە، واتە: ڕۆژی دووجار، بەبێ ئەوەی ڕووی لێ گرژ کردبێت، یان خۆی بە لێقەوماو و گرفتار و ماڵوێران نیشانی هاوسەرەکەی دابێت، بەڵکو لەوەش سەیرتر ئەوەیە کە مایەی سەرسامیە لە سەدەی بیستەمدا هاوسەری ئاوا وەفادار هەبێت، هاوسەرەکەی مۆڵەتی داوە ژنی تر بهێنێت، بەڵام لە وەڵامیدا هەموو جارێك وتویەتی: من کە غەم و پەژارە و گرفتارییم دەبوو، تۆ دڵخۆشییت دەدامەوە و بە دەورمدا دەهاتی و قسەی خۆشت بۆ دەکردم، چۆن دەبێ ئێستا من سپڵە بم و پاداشتی تۆ نەدەمەوە، کە تۆ ئێستا دووچار و گرفتاری ئەم تاقیکردنەوە خواییە بوویت؟ بە خوا هەرگیز خەفەتی وا بە دڵی تۆدا ناکەم و چۆن تۆ لە ماوەی ژیانی هاوسەرییماندا بۆ منت سەلمان کە هاوسەری ڕاستەقینە و دڵسۆز و ئەمەکداری من بوویت، دەبێ منیش بۆت بسەلمێنم کە هاوسەری وەفادار و خەمخۆری تۆم و هەموو ئەو قسەو وتە شیرین و گفتوگۆ و بەڵێنانەی لەسەرەتای یەکتر ناسینمانەوە بە تۆم داون، بە ڕاستم بوون و ئێستا بە کردەوە بۆت دەسەلمێنم.

ئەوە بەرهەمی دینە و بەرهەمی ئیسلامە، دەنا چەندەها کەس دەبینی تەنها یەك وشەی هەڵە لە هاوسەرەکەی قبوڵ ناکات و تەنها بەجوانی و بەلاوی دەیەوێت و لە تاف پیری و لە

کاتی نەخۆشیی و زەبوونیدا دەبێتە دوژمنی، چەند پیاومان بینی و بیستمان لە سوڵح و مەحکەمەیاندا دانیشتین، کە لەسەر سادەترین شت، بەڵکو لەسەر هیچ لە دادگا ژنەکەی تەلاق دەداو لێی جیا دەبێتەوە، یان وەکو سوکایەتیی پێکردن ژنی بەسەر دێنێ و پێی دەڵێ ژنە کۆنەکە و ژنە پیرەکە و کارەکەرەکە و..... هتد.

ئەوە لە وڵاتی موسڵماناندا، ئەگەر نا باسی ناموسڵمانان هەر مەکە، کەلەئاهەنگێك دا زۆریان چەندەها پیاو دەگۆڕن، لە هەفتەی حەوت ڕۆژیدا، حەوت پیاو دەگۆڕن، یان پیاوەکانیان لە یەککاتدا پەیوەندییان لەگەڵ دەیەها ئافرەت هەیە و وەفایشیان بۆ هیچیان نییە.

هەندێ پیاو (شهر العسل) لە ژنەکانیان دەکەن بە (شهر البصل) و بێوەفا و بێبەزەیی و بێ سۆز و سپڵە و پێنەزانن، بەیەك قسە لە هاوسەرەکەی جیا دەبێتەوە و تەلاقی دەدات.

حاجی تۆفیق پیاوێکی نەخوێندەوارە، بەڵام خاوەن بەهرەیە، زیرەکە، بیرتیژە، خواناسە، بە ڕەنجی شانی خۆی دەژی و نیازی بە کوڕو کچ و کەس وکاریشی نییە، دەربارەی ژیانی هاوسەرایەتی و پەیوەندیی نێوان خۆی و پورەمینای خێزانی و هاوسەری لێمان پرسی، وتی: شەست و چوار ساڵە ژنم هێناوە و زۆریش تووڕە بووم و زۆرجاریش شەڕمان بووە، بەڵام نەمهێشتووە خەڵك بە کێشە و شەڕمان بزانن و یەك ژەمیش بەعاجزی و زویری نانمان نەخواردووە، کە ژەمە خواردنەکە ئامادە دەکرا، بانگی مینام دەکرد و دەموت: مینا وەرە بەخوا بەبێ تۆ پارویەکەم بۆ قوت ناچێ، ئەویش خوا پاداشتی بداتەوە بە گوێی دەکردم.

پیاوێکی باڵخەیی حاکم بانگی کرد لەسەر کێشەیەك تەلاق بخوات کە نزیکەی (١٥) ساڵ زیاتر، یان کەمتر ژنەکەی مردبوو، وتی: بەخوا تەلاق ناخۆم فلانی (..... ) خێزانم لێم عاجز دەبێت.

# هاوسەری بەوەفا

ئافرەتێکی خواناس و شارەزا لە دین هەبوو بە ناوی (موعازەی کچی عەبدوڵڵا)، زۆر کەس چوونە داخوازیی، بەڵام ڕازی نەبوو بە کەسیان، تەمەنی زۆر بوو، بووە ئافرەتێکی کامڵ، سەرەنجام زانا و خواناسی پایەبەرز (واصلی کوڕی ئەشەم) ناردیە داخوازی، وەك دەڵێن خوا قەڵەمی لێدابوو، دەستی بە ڕوویەوە نەناو ڕازی بوو، بەڵام لە نێوان خۆیاندا چەند مەرجێکیان بۆ یەکتر دانابوو:

ئەگەر شەو هەستای بۆ شەونوێژ، منیش خەبەر کەیتەوە، ئەگەر لەپێش مندا شەهید بوویت و ڕێگای تکات پێدرا، لە لای خوا تکام بۆ بکەی.

هەردووکیان ئەم بەڵێنانەیان بە یەکتر دا و قەبوڵیان کرد، دوای چەند ساڵ لە هاوسەرێتی پڕ شانازی و بێ گیروگرفت، لە غەزایەکدا واصل و کوڕە گەورەکەی لە یەك ڕۆژدا شەهید بوون و هەواڵی شەهیدبوونیان گەیشتەماڵەوە، کۆمەڵێ لە ئافرەتی دراوسێ و خزم و دەوروبەر کۆبوونەوە و ڕۆیشتن بەرەو ماڵیان بۆ پرسە و سەرەخۆشیی، کاتێك چوونە بەر دەرگا و داوای مۆڵەتی چونە ژوورەوەیان کرد، موعازە خۆی چوو بەرەو پیریان و پێی وتن: ئەگەر بۆ پرسە و سەرەخۆشیی هاتوون، مۆڵەتی چوونە ژوورەوەتان نییە و خواتان لەگەڵ، ئەگەر بۆ پیرۆزبایش هاتوون، یاخوا بەخێربێن سەر چاومان.

بە هەرحاڵ دوای شەهیدبوونی هاوسەرەکەی بە تەواوی لێبڕا بۆ خواپەرستیی، دوای حەوت ساڵ لەو ڕووداوە موعازەخان نەخۆش کەوت و کەوتە سەرجێگا، لەسەرەمەرگداو لە کاتی گیانەڵادا بەدەم ژان و ئازاری سەرەمەرگەوە ڕووی وەرگێڕا بۆ لای چەپی و دەستی کرد بە گریان، هەر دەستبەجێ ڕووی وەرگێڕا بۆ لای ڕاست و دەستی کرد بە پێکەنین، لێیان پرسی: هۆی چیبوو بە لای چەپدا ڕووت وەرگێڕاو گریایت، بەڵام بەلای ڕاستدا ڕووت وەرگێڕاو پێکەنیت؟ وتی: ناتوانم بۆتان باس بکەم.

زۆریان تکا لێکرد، ناچار وتی: کە بە لای چەپدا ڕووم وەرگێڕا شوێنی شەونوێژەکەم بینیم زانیم لە مەودوا چۆڵ دەبێ، لەوە زیاتر شەونوێژم بۆ ناکرێ، بۆیە دڵم پڕ بوو، گریام، کە

ڕوویشم وەرگێڕا بۆ لای ڕاستدا هاوسەرەکەم بینی، ئەو بەڵێنەی کە لەسەرەتای هاوسەرگیرییمدا پێی دابووم، هاتبوو جێبەجێی بکات.

ئەوانیش زۆر ئەم قسەیان پێ سەیر بوو وتیان چۆن؟

وتی: واصلی هاوسەرم لە یەکەم هەنگاوی ژیانی هاوسەرێتیماندا بەڵێنی پێدام ئەگەر لە پێش مندا شەهید بوو لە لای خوا تکام بۆ بکات، کە ڕووم وەرگێڕا بۆ لای دەرگاکە ڕوحی هاوسەرەکەم بینی لەسەر شێوازی خۆی هاتبوو مژدەم بداتێ، ئیتر من لەگەڵی دەڕۆم، بەو جۆرە شایەتمانی هێنا و گیانی سپارد.

## یا خوا حاجی لەمشەو زیاتر بە تەنیا لە گۆڕدا نەبیت

کاتێك ژن و مێردی دڵسۆز دەبینی، یان بەسەرهاتەکەیان دەخوێنیتەوە و دەبیستی، دڵت بە ژیان خۆش دەبێ و دەروونت ئاسوودە دەبێ وئومێت بۆ ژیان درووست وتازە دەبێتەوە، کاتێك دەبینی ژن ومێردی یان جووتە هاوسەری زۆر ئاسوودە و بەختیار و دڵشاد و کەیفخۆش، خاوەنی ئومێدی بەرز و بڵند بە ژیان، دەبێ چۆن لێکبدرێتەوە؟ بڵێی ئەم دوو هاوسەرە خاوەن بڕوانامە بن، یان زۆر ڕۆشنبیر و شارەزا بن؟ دەبێ بڕوانامەی ماستەر، یان دکتۆرایان هەبێ؟ نا.. نا وانییە، ژیانی هاوسەرێتیی (هونەر)ە، نەك (زانست)، کردار و ڕەفتار و وتەی شیرین و هەڵوێستی جوان و قەشەنگە، نەك نووسینی کتێب و بابەت و توێژینەوەی سەر کاغەز.

بەختەوەریی ژن و مێرد بریتیە لە دین و ڕەوشتی بەرز، بەختەوەریی ژیانی دوو هاوسەر بەرهەمی دین و ڕەوشتی بەرزە، با ئێمە بێین و سەرنج بدەین بزانین دوو هاوسەری نەخوێندەوار، کە زۆربەی تەمەنیان لە لادێ بەسەر بردووە، چی بۆتە هۆی بەختەوەرییان!؟ خۆ ئەوان بە قەولی ئەمڕۆ خوێندەوار نەبوون، بڕوانامەیان نەبووە، لە هیچ زانکۆ و کۆلێژێك نە قوتابی بوون، نە مامۆستا، دەوڵەمەندیش نەبوون، خاوەنی بازاڕ و باڵەخانەش نەبوون!.

حاجی کوێخا تۆفیق خەڵکی گوندی (میراوا)ی شارباژێڕی سەخت، لەگەڵ هاوسەرەکەیدا ژیانێکی خۆش وبێ غەم وخەفەتیان بەسەردەبرد، خۆشیی دەروون و گیان، بەردەوام لەگەڵ یەکدی ڕووخۆش و قسەخۆش و دڵنەرم و بەوەفا و بەئەمەك بوون، زۆر وەسفی یەکتریان دەکرد و هەرگیز ئامادە نەبوون بە سووکیی باسی یەکدی بکەن، هەرگیز ڕێگەیان نەدەدا کەس بە ئەندازەی سەنگی باڵە مێشوولەیەك باسی ئەوی تریان بە خراپە بکات و قەبوڵیان نەدەکرد.

کە لەگەڵ حاجی دادەنیشتی چاکترین و جوانترین و ژیرترین ژن، حاجیژن بوو، کە لە حاجی کوێخا ژنیشت دەپرسی دەربارەی کوێخا تۆفیق بە بەرێزترین شێوە ناوی دەبرد، زۆر وەسفی دەکرد، لە پیاوەتیی و دڵنەرمیی و سوڵح و سەلاحەت و میوانداریی و ڕێزداریی و..... هتد، هەروەکو ئوم زەرع وەسفی ئەبوزەرع بکات کە فەرموودەیەکی ڕاست و دروستە و پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر) بە عائیشەی فەرمووە: من وەکو ئەبو زەرع وام بۆ تۆ، بەڵام من لێت جیانابمەوە و تەڵاقت نادەم.

لە ژیانیاندا کەس ئاگاداری کێشەی ئەم دوو هاوسەرە نەبووە، کەس سوڵحی نەکردوون، بە ئامادەبوونی کەسی سێهەم ئەگەر منداڵیش بووبێت قسەی زبر و ناخۆشیان لێ نەبیستراوە، زۆر زۆر ڕێزیان لە یەکتر دەگرت، زۆر کەس ئاواتی بە ژیانیان دەخواست، کوێخا تۆفیق تەنها کوێخای گوندی میراوا بوو، بەڵام بە بۆچوونی هاوسەرەکەی، شایستەی کوێخایەتی وڵاتێك بوو.

هەر کە کوێخا تارمایی دەرکەوتایە ئەم بەرزەپێ لەبەری هەڵدەستا، دەستی بۆ لەبەر سنگی دادەنا و بەخێرهاتنی دەکرد، ڕووی خۆشی نیشان دەدا و بە گەرمیی پێشوازیی لێدەکرد، وەکو چۆن پێشوازیی لە پاشای وڵات دەکرێت.

لە ساڵی (٢٠٠٦)کوێخا بە ڕەحمەتی خودا چوو، دوای ژیانێکی بەختەوەر و شاهانە لەگەڵ هاوسەری خۆشەویست و بەوەفای، با بزانین هاوسەری وەفاداری کوێخا هەڵوێستی چیبوو لە پرسەکەی کوێخادا، هەر لە کۆڕی ماتەمینی مەرگە کوێخادا وەفاداریی و بەئەمەکیی خۆی بۆ کوێخا نواند، لەبەرچاوی خەڵکی کوێخاژن هەردوو دەستی بەرز کردەوە و وتی: (یا خوا کوێخا خوا لێت خۆش بێت و لەم شەویش زیاتر بە تەنیا نەبیت!). واتە: من بێم بۆ لات.

کوێخا ئەمڕۆ مرد، ئەم شەویش بە تەنیا لە گۆڕدا مایەوە، بۆ بەیانی نژاکەی کوێخاژن گیرا بوو، ئەویش مرد و چوو بۆ جیهانی ئەودیو پەردە، بۆ لای هاوسەری خۆشەویستی وبە ئاواتی خۆی گەیشت، یەکسەر نزای وەفاداری گیرا بوو، هەر بۆ سبەینێ حاجیژن بە بێ نەخۆشیی گیانی سپارد و ڕۆیشت بۆ لای حاجی هاوسەری، سبحان الله العظیم.

حاجیژنی هاوسەری کوێخا تۆفیق نەخوێندەوار بوو، ڕەش و سپی لێك جیا نەدەکردەوە، بەڵام شاژنی ئێران هاوسەری موحەممەد ڕەزا شای پەهلەوی، خوێندەوار، خاوەن شەهادە و یەکەم خانمی ئێران و خاوەنی ناونیشانی بێناوەڕۆکی گەورە و سەرداری خانمانی ئێران و خاوەنی چەندەها ناونیشان و نازناوی بریقەداری تر، بڕوانە بۆ وەفاداریی ئەم شاژنە گەورەیە. !

کە شای ئێران لێی قەوما و داوای پەنابەریی لە هەموو دونیا دەکرد و کەس نەیگرتە خۆی، بە پاڕانەوەیەکی زۆر وڵاتی میسر ڕازی بوو کە پەنای بدەن، هەر بە گەیشتنی بۆ وڵاتی میسر شاژنی بیر هاتەوە، دەبێ لە کوێ بێت، کەوتە هەواڵ زانینی، بڵێی وەکو حاجیژنی هاوسەری حاجی کوێخا تۆفیقی مێراوا شاژنیش کۆڕی پرسە و ماتەمینی گەرم کردبێت بۆ هاوسەرەکەی؟ یان بە دوای هەواڵ زانینیدا وێڵ بووبێت؟

بە گەیشتنی شاژن بۆ وڵاتانی ڕۆژئاوا بە بێتەڵاق و جیابوونەوە لە شای لێقەوماو و خەفەتبار، شووی کردەوە و لەگەڵ پیاوێکی ئەڵمانییدا دەستی تێکەڵ کرد.

ئەم دوو ژنە کامیان دەوڵەمەند وخوێندەوارتر و شارەزاتر و ناودارتر و..... هتد بوون؟ کامیشیان بەوەفاتر و بەشەرەفتر و بەئەمەکتر بوون؟ ئافرەت هەتا خوێندەوار و شارەزا و بلیمەت بێت، هەر کەمە، بەڵام لەگەڵ ڕەوشتی موسڵمانانەدا.

# هەر لە وەفادارییدا

برادەرێکم پیاوێکی ناودار و ناسراوە و خاوەن کەسایەتییەکی چاك و بەرچاوە، بەڵام بۆیە ناوی ناڵێم، عەرەب دەڵێن: (الفتنة نائمة، لعن الله من أيقظها)، دەترسم ناوهێنانی فووکردن بێت بە ژیلەمۆی ئاگری ئەو فیتنە خەفەکراوەدا.

بەهەرحاڵ وتی: لە لادێ بووم کاری جوتیاری و کشتوکاڵ و دەخڵ و دان و خەلە و خەرمان و ڕەز و باخدارییمان دەکرد، ڕۆژێك جوتم دەکرد، ژنبرایەکم تووڕە کرابوو، لە منیان هاندابوو، هات بۆ لام دەستی کرد بە قسەی نابەجێ، زۆرم لەگەڵ وت و کەمی بیست، کاکە ئەمە هەر کێشە نییە، چی دەڵێی دەیخەمە سەرچاو، چۆن بە چاکی دەزانی وا دەکەم، ئێمە خزمین، گۆشت و خوێنمان تێکەڵە، تۆ برای خێزانمی، برا گەورەی منیشی، ئەو قسانەی بۆیان کردووی وانییە، نەخێر قسەی وەرنەگرت و نەیهێشێت جووتەکەم بکەم، پەلاماری دامێ و یەکلایەنە شەڕی داگیرساند و منیش بۆ ترساندنی خەنجەرەکەم دەرهێنا وتم: وازنەهێنی دەتکوژم، بەڵام ئەوەندەیان فوودابوو لە دژی من چاکتر هەڵمەتی دەدامێ، پیاوێکی بە تاقەت وتێکسمڕاو، بەهێزیش بوو، هەر نازانم لە ترسی گیانی خۆم چۆن خەنجەرەکەم داهێنا و لە ناو قەدی پشتی درا و موراغەی پشتی دەراودیو کون کرد، پیاوە لە حەوتسالان ڕاست بوەوەو دەستبەجێ مرد، منیش لە داخ و خەفەتا سەرم لێشێوا، جوتم بەرەڵڵا کرد و گاجووتەکانم بەستەوە و بەسەر دار و بەرددا ڕام کرد بۆ ماڵەوە و خۆم گەیاندە خێزانم و زۆر بە دڵێکی تەنگ و پڕ داخ و خەفەتەوە بەسەرهاتەکەم بۆ گێڕایەوە، بەڵام ئەوەی من بە گوێی خۆم بیستم لەوانەیە کەسیش چاوەڕێی نەدەکرد، بە چاوی خۆم بینیم، لە هەڵوێستی مەردانەی هاوسەرەکەم، خوا ڕووسووری دونیا و قیامەتی بکات، وتی: جا ئەمرت بە چییە؟

وتم: وەڵلا تازە سەرم لێشێوا وماڵم لێ وێران بوو، بە خوا من بۆ جووتکردن چووم، خوا دەیزانێ بۆ پیاوکوشتن نەچووم و بە ئاواتیشم نەخواستووە، جا تۆش بچۆرەوە ماڵی باوکت و لێرە مەبە، با تۆش بە ناهەق تووش نەبیت.

ژنی مەرد و بە وەفا، وتی: ئەوە بە ڕاستە!، من بە شەرعی خوا لە گەڵ تۆ بوومە هاوسەر، گرێبەست و مارەیی من و تۆ بە کوشتنی برا هەڵناوەشێتەوە، بە خوا دەبێ بیسەلمێنم کە بەڕاستی هاوسەری تۆ بووم و وەفاداریی خۆم بسەلمێنم، بەو خوایەی من و تۆی دروست کردووە لە تەنگانەدا جێتناهێلم و گورگان خواردووت ناکەم.

وتم: ئاخر کاتی ئەوە نییە، ئێستا ماڵی باوکت و کەسوکارت دێنە سەرم، وتی: منیش ئەو چەکە لە شانم دەکەم و بەرگریت لێدەکەم، هەتا من نەکوژن ناهێڵم تۆ بکوژن، بۆ فلان، ژن بۆ تەنگانەیە یان بۆ فەرەحی؟ هەرچەند لەگەڵم وت، بەڵام وتی: بە خوا ماڵی خۆم سەنگەری منە و بۆ هیچ کەسی چۆڵ ناکەم.

بەڵێ هاوسەری بەڕێز و بە ئەمەکم پشتی بەرنەدام و نەچووە ماڵی باوکی هەتا سوڵحمان کرد، منیش هەتا ماوم دوعای خێری بۆ دەکەم و شانازیی پێوە دەکەم، ئومێدیشم هەیە لە بەهەشتیشدا بە یەکەوە بین، هەروەکو ئێرە مایەی شانازییمە، لەو دونیاش بە هاوڕێیەتی ئەو شاد و سەربەرز بم.

# وەفاداریی ژن

مامۆستا مەلا خالید بەڕێوەبەری پەیمانگەی ئیسلامیی (معهد الاسلامی) بوو لە سلێمانی، دواتر ماستەری بە دەستهێنا و بووە مامۆستا لە زانکۆی سلێمانی، خۆم بۆ ماوەی شەش ساڵ لە پەیمانگە قوتابی مامۆستا بووم (نووسەر)، لە کۆتایی ژیانیدا (ساڵی ٢٠٠٨) نەخۆش کەوت، جەڵتە لێیدابوو و توانای جموجوڵ و خۆپاککردنەوەی نەمابوو، پێشتریش ژنەکەی تەڵاق دابوو، لە یەك جیابووبوونەوە، بەڵام لەو کاتەدا کە لەماڵەوە کەوتبوو، کەس نەبوو خزمەتی باشی بکات، لەو حاڵەتانەشدا مرۆڤ زۆر بە زەحمەت خزمەت و ئەمدیو و ئەودیو دەکرێت و پاکدەکرێتەوە، ئەگەر کەسی دڵسۆزی نەبێت دوور نییە کرم لێی بدات و بۆگەنیش بکات، بەڵام لەم کاتەدا هاوسەری تەڵاقدراوی وەفاداریی خۆی نواند و چاکەکاری خۆی سەلماند، هەڵوێستێکی نواند کە دەبێ کەسوکاری و دۆستانی، بەڵکو ئافرەتانیش بە گشتیی شانازیی بکەن، بەوەها خزم و دۆست و تاکێکی کۆمەڵگە و ڕەگەزەکەیانەوە.

بەهەرحاڵ هاوسەرە سەنگین و دڵسۆز و وەفادارە تەڵاقدراوەکەی دەچێتە خزمەت مامۆستایەکی شارەزا و متمانەپێکراو، دەڵێ: مامۆستا بۆ پرسیارێك و پرس و ڕایەك هاتوومەتە خزمەتت، وتی: فەرموو، وتی: هاوسەرەکەم فڵان کەسە ـ جەنابیشت باشی دەناسیت ـ چەند ساڵێکە منی تەڵاقداوە و لێی جیابوومەتەوە، بەڵام ئێستا لەسەر جێگە کەوتووە و جەڵتە لێیداوە، کەنەفت و پەککەوتەیە و خۆی بۆ پاکناکرێتەوە و ناتوانێت بچێتە سەرئاو، هەڵسوکەوتیشی بۆ ناکرێت، تەنانەت ناتوانێت خواردن و خواردنەوەش بخوات، دەبێ بە دەمیەوە بکرێت، ڕاستە ئەو خانە و لانەی لە من شێواند، ماڵی لێتێکدام و سەرگەردانی کردم، خەم و پەژارە و ناسۆریی زۆری بە دڵدا کردم، بەڵام ئێستا کە لێی قەوماوە و داماو بووە، دەمەوێت تەنها لەبەر خودا بچم خزمەتی بکەم هەتا دەمرێت، یان باشتر بڵێم تا دەتوانم خزمەتی بکەم و بە تەڵاقدراوییش دڵسۆزی خۆمی بۆ بنوێنم، ئایا شەرع ڕێگەم پێئەدات؟

مامۆستا زۆر سەری سووڕما کە ئەم خوشکە پاداشتی خراپە بە چاکە ئەداتەوە، بۆیە بە سەرسامی فەتوای بۆ ئەدات و پێی دەڵێ: وەکو تۆ دەڵێیت کە هیچ توانا و ئارەزوو و دەسەڵاتێکی نەماوە، دروستە بچۆ خزمەتی بکە.

ئافرەتەی دڵسۆز و بەوەفا بە بیستنی فەتواکە گەش دەبێتەوە و دڵی خۆش دەبێت، دەڕوات بۆ خزمەتکردنی مامۆستا و ماوەی نزیکەی دوو ساڵ بەو حاڵە خزمەتی دەکات، تا مامۆستا بە ڕەحمەت چوو.

خوا پاداشتی ئەو خوشکە بداتەوە و نموونەی زۆر بێت، سەرمان بەرزە کە نموونەی ئاوا بەرزمان هەیە.

# غیرە و وەفاداریی پیاو

**لە کتێبی (موسوعة أخلاق الرسول)، محمود المصري، هاتووە:**

(٥٠٠) مسقاڵ مارەیی قەرز بوو لای هاوسەرەکەی و ئەویش ئینکاری لێدەکرد، چوونە مەحکەمە، قازی دوو حەکەمی دانا بوو بۆ تەحقیقکردن لە کێشەکەیان، لە پیاوەکەیان پرسی، قسەی خۆی کرد، لەسەرەی قسەکردنی ژنەکەدا شاهیدەکان (حەکەمەکان) وتیان: دەبێ پەچەکەت لادەی هەتا ڕووخسارت ببینین و بتناسینەوە، لە مشتومڕی ئەوەدابوون هاوسەری ژنەکە هەڵیدایە، وتی: پەچەکەی پێ لامەدەن، پێنج سەد دینارەکەی دەدەمێ، ژنەکەش وتی: مادام ئەوەندە بەغیرەتە بۆ من، ئەوا منیش گەردنم ئازاد کرد لە (٥٠٠) مسقاڵە ئاڵتوونەکە و لەگەڵیشیدا ڕۆیشتمەوە و لێی جیا نابمەوە.

# حەڤدە ساڵ

# چاوەڕێی دەستگیرانە بەندکراوەکەی کرد

کاتێك زانای خەباتگێڕ و خواناس و ماندووییەناس (کەمال سەنانیریی) لە میسر بۆ چەندەمین جار بەند کرا لەسەر ئیسلام و خزمەت کردنی بانگەوازی ئیسلامیی، ئەو جارەیان لە ساڵی (١٩٦٥)دا بوو بەند کرا، رۆژێك لە کاتی هێنانە دەرەوەیدا بۆ سەر ئاو، لە رێگەدا بەخزمەتی زانای پایەدار و تێکۆشەر، شەهید سەیدقوتب، گەیشت، دەرفەتی چەند قسەیەکیان پێدرا، سەیید فەرمووی: بۆ بێ کەیفی؟ ئەویش وتی: ئاسایش و دەزگای هەواڵگریی حکومەت زۆریان بۆ هاوسەرەکەم هێناوە، داوای تەڵاقم لێبکات و لێم جیا بێتەوە، ئەگەر وا نەکات دەستدرێژیی دەکەنە سەر.

سەییدیش فەرمووی: خەفەت مەخۆ، ئەگەر ڕازی دەبی من ئامینە قوتبی خوشکمت پێشکەش دەکەم، ئەویش وتی: جەنابی سەیید، من حەڤدە ساڵ حوکم دراوم و ئێستا چەند مانگێکم تەواو نەکردووە و بەر لێبوردنیش ناکەوم، فەرمووی: گرنگ ئەوەیە ئامینە ڕازی بێت، کاتێك هەواڵیاندا بە ئامینە قوتب، وتی: هەرچۆن کاکم پێی خۆشبێ، وا دەکەم.

بەڵێ خاتو ئامینە قوتب بووە دەستگیرانی زانای موجاهید و نەبەز (کمال سەنانیریی) و حەڤدە ساڵ بەدەستگیرانی بە دیاریەوە دانیشت تا لە بەندیخانە ڕزگاری بوو و ماوەی حوکمەکەی تەواو کرد.

دواتر ئەو دوو دەستگیرانە بەوەفا و خەباتگێڕ و خانەدانە بوون بە هاوسەری یەکتر، بەڵام دوای چەند ساڵێك حکومەتی میسر کەمال سەنانیری شەهید کرد و ئامینە قوتبیش شانازیی بە شەهیدبوونی هاوسەرەکەی و براگەورەکەی (سەید قوتبەوە) دەکرد و لە چەند دێرێکدا دەڵێ: سەیید کاتێ هەڵواسراو لە سێدارەدرا بووە مایەی شانازیی بۆ ئێمە و شوێنکەوتووانی کاتێك بەری پێی لەسەری ئەو کەسانە بەرزتر بوو کە ئیعدامیان کرد.

منیش لەم باسە پڕ شکۆیەدا شیعرەکەی جەمالەددینی ئەفغانی دووبارە دەکەمەوە:

علواً في الحياة و في الممات          والله إنك لأحدى المعجزات

واتە: هەر بەرزی بە زیندوویی و بە شەهیدکراوی بە داری سێدارەوە، وەڵا تۆ یەکێکی لە شتە سەرسوڕهێنەرەکان.

## سەگێک هاوڕێکەی دەبات بۆ لای پزیشک

**دکتۆر عانیز قەڕەنی، لە پزیشکێکی ئێسکەوە گێڕایەوە:**

کە لە یەکێك لە وڵاتە خۆرئاواییەکان لە کاتی گەڕانەوەیدا بۆ ماڵەوە، لە ڕێگا چاوی بە سەگێك دەکەوێت کە دەستی شکاوەو پەك کەوتەیە، ئەویش زۆر بەزەیی پێیدا دێتەوە، بۆیە لەو خواردنەی پێیەتی هەندێکی دەداتێ و سەگەکەش بەشەلە شەل دوای دەکەوێت هەتا دەیباتە ماڵەوە، لەوێ دەستە شکاوەکەی بۆ هەڵدەبەستێتەوە و هەندێك خواردنی تری دەداتێ و پاش ماوەیەك دەیکاتە دەرەوە و بەڕێی دەکات و دەرگاکە دادەخات، دوای هەژدە ڕۆژ لە دەرگای ماڵەکەی دەدرێت، چەند جار لە دەرگاکە دەدرێتەوە، کاتێك کاکی پزیشك دەرگاکە دەکاتەوە شتێکی زۆر سەرسوڕهێنەر دەبینێ، سەگە دەست شکاوەکەیە هاتووە و لە دەرگا دەدا، پزیشکی چاکەخوازیش لە دڵی خۆی دا دەڵێ: دەبێ دەستی جێگەی خۆی نەگرتبێتەوە، هاتووە بۆ سەردانی پزیشك هەتا نیشانی بدات، یان هاتووە سوپاسی پزیشکەکە بکات، یان کارێکی تری هەیە کە پزیشکەکە و من و تۆش بە خەیاڵماندا نەهاتووە، شتێکی سەیر و سەمەرەم بینی، سەرم سوڕما، ئێوەش بە بیستنی سەرتان سوڕدەمێنێ، بینیم ئەو سەگەی دەستم بۆ هەڵبەستەوە، سەگێکی تری دەست شکاوی

هێناوە هەتا دەستی ئەویش هەڵبەستمەوە، بۆیە منیش زۆر بە شانازیی و بێبەرامبەر و وەرەقەبڕین دەستم بۆ ئەویش هەڵبەستەوە و بەڕێم کردن.

دووشەممە ٢٠٠٦/٨/٧

# بە لەتێک نان چەند ساڵ پاسی کردم

**مامۆستا (مەلا عبداللە)ی قاڵیجۆ ئەم بەسەرهاتەی بەسەرهاتووە لە نێوان ساڵانی (١٩٩٣ ـ ١٩٩٤) و خۆی بۆی گێڕامەوە وتی:**

لە کۆمەڵگای برایەتی (باریکە) پێشنوێژ و وتارخوێن بووم، دەبوایە پێنج فەرزە بچم بۆ مزگەوت بۆ پێشنوێژیی، تازە لەوێ جێگیر بووبووم، ئەوەبوو هەموو جار کە لە ماڵ دەردەچووم سەگی دراوسێکەمان پەلاماری دەدام و پێم دەوەڕی، ناچار خاوەنی سەگەکەم ئاگادار کرد، کە ناوی (مام عەلی) بوو، خەڵکی (تەپەکەل) بوو، وتی: (مامۆستا من بۆت عاقڵ دەکەم، خەمت نەبێ، تۆ پارچەیەک نان بێنەو وەرە با ئامۆژگاریی سەگەکەت بۆ بکەم).

منیش ئامادەی بەخشینی هەمو شتێك بووم بە مەرجێك گیانم سەلامەت بێت، بۆیە پارچەیەك نانم هەڵگرت و شوێن مام عەلی کەوتم، هەر سەگەکە هەستی منی کرد، وەکو جاران دەستی کردە وەڕین و خۆی ڕاپسکاند، بەڵام ئەم جارە ترسم لێی نەبوو ، مام عەلی لە گەماڵەکە تووڕەبوو، پێیوت: (پاش.. پاش)، ئیتر سەگەکە پاڵ کەوت و مام عەلیش قاچی خستە سەر ملی و پێیوت: (ئەمە مامۆستای خۆمانە، عەمرت نەمێنێ، لە جیاتی پاسی خۆی و ماڵەکەی بکەی، پێی دەوەڕیت؟!)، ئیتر مام عەلی بە منی وت: (پارچە نانەکەی بدەرێ)، منیش پارچە نانەکەم بۆ فڕێدایە بن پێی مام عەلی، سەگەکە پەلاماری دا و خواردی، ئەم بگرە و بەردەیە دوای گەڕانەوەمان بوو لە نوێژی شێوان، بۆ نوێژی خەوتنان کە سەعاتێکی

پێچوو، هاتمە دەرەوە بڕۆم بۆ مزگەووت، خوا ئاگادارە سەگەکە بە شوێنمدا هات و هەتا گەیشتمە مزگەوت پارێزگاری لێکردم، ئیتر لەوە دوا هەتا لە باریکە بووم پاسەوانی بەلاش و دڵسۆزی خۆم دەست کەوت، هەر کەسیش بهاتایە بۆ ماڵمان پێی دەوەڕی و پاسی خۆمان و ماڵەکەشمانی دەکرد، هەتا خۆمان مۆڵەتمان نەدایە نەیدەهێشت کەس بە شەو خۆی بە ماڵماندا بکات.

خەڵکی بە زۆری لەسەر سپڵەیی دووچاری زۆرێك لە سزای دونیا و دوارۆژ دەبن، کەسانێك کە خوا ئەوەندە بەهرەی پێبەخشیون کە لە ژمارە نایەن، وەکو دەڵێن لە حەدد و حیساب نایەن، بەلام تەنها بە ئەندازەی سەگەکەی مام عەلی ئەمەکدار و وەفادار نین، ئەریّ لەتە نانەکەی مامۆستا عەبدوڵلا گرنگتر و بەنرختره لەو بەهرەگەلەی خوا؟

یان ئاژەڵ ژیرتر و خوێندەوارتر و بەرێزترە لەو ئادەمیزادەی، خوا دەفەرموێت: بەدەستی خۆم دروستم کردووەو کردویەتیە جێنشینی خۆی و هەموو بوونەوەری بۆ ڕام هێناوە و سەدوبیست و چوار هەزار پێغەمبەری بۆ ڕەوانە کردووە و هەزاران کتێبی بۆ کردونەتە دیاریی و قورئانی پیرۆزی کردۆتە بەرنامەیان و دەیان هەزار زانای بلیمەت و ورە پۆلایین و پسپۆڕ لە هەموو بوارەکانی ژیان دا بوونەتە ئەستێرەی ئاسمان و لە شەوە زەتگی تاریکستانیدا ڕێگەی ڕاستیان بۆ خەڵکی کردۆتە نوێژی نیوەڕۆ؟؟!

دەبیّ سەگێکی بەستەزمان بە بیّ شەهادە و خوێندەواریی و ژیریی و دانایی و... هتد، لەتە نانێکی لەبەرچاو بێت، بەلام مرۆڤی دەستکرد و نیگاری ناوازەی پەروەردگار کە بە دەستی خۆی پەیکەری بۆ دروست کردووە و کار و بەرنامەی خۆی لەسەر زەوی بەو سپاردووە و کەسانێکی لە خۆیان هەڵبژاردووە و کردونی بە شاگوڵی باخی بوونەوەر و پەیامبەر و ڕاسپاردەی خۆی، کە یەکێك لە قەشەکان دەڵیّ دەبیّ بوونەوەر شانازیی بکات بە بوونی کەسێکی وەکو موحەممەد کە لە توخم و ڕەگەزی ئەوە، دەبیّ ئەم مرۆڤە سپڵە بێت؟!!.

# پاسی هەردووکیانی دەکرد

**هەر مامۆستا عەبدوللای قالیجۆ بۆی گێڕامەوە وتی:**

هەر لە ئۆردوگای باریکە دوو پیاو بە ناوی حەسن مەلا عەبدولکەریم و عەبدولکەریم حەمە وەلی) هەبوون، خانوویان نەبوو، ناچار هەردووکیان ماڵیان بردە خانویەکی فەرمانگەی کشتوکاڵ، سەگێك پاسی ماڵەکەیانی دەکرد، هەر وەکو یەك ماڵ وا بوون، کەسێك باش نەیناسینایە هەستی بەوە نەدەکرد کە دوو ماڵن، چونکە لە یەك دەرگاوە هاتوچۆیان دەکرد.

دوای ماوەیەك هەردووکیان خانووی خۆیان کرد و هەر کەسە چووە خانووی خۆی، سەگەکەش لەوە پێش پاسی کردبوون و هەر بەیەك ماڵی زانیبوون، کاتێك هەر کەسە چووە خانوی خۆی پاسی هەردووکیانی دەکرد، لە ئێوارەوە هەتا نیوە شەو پاسی ماڵێکیانی دەکرد، پاشان دەچوو بۆ ماڵەکەی تر هەتا بەیانی لەوێ دەوامی دەکرد و پاسی ئەوانی دەکرد، چونکە پێشتر کە پێکەوە بوون نمەکی هەردووکیانی کردبوو.

تەنانەت شەو کە بۆنی بە پێڵاوەکانەوە دەکرد هەڵیدەگرت و دەیبرد بۆ ماڵەکەی تر، ئەگەر تاکێك پێڵاو لە ماڵێکیان دیار نەمایە لە ماڵەکەی تر دەیاندۆزیەوە و دەیانزانی سەگەکە شەو ئاڵوگۆڕی پێکردوون، لەم ڕووداوە پەند و ئامۆژگاری وەرگرە، ئەی ژیری دانا!.

# کڵپەی گڕو تینی دڵ و دەروونی دایک بە چی دادەمرکێ؟

**زانای ناوداری ئیسلامی دکتۆر سەلمان بن فەهد عودە، کە لە عەرەبستانی سعودیە نیشتەجێیە، لە کۆڕێکیدا فەرمووی:**

کوڕێك پاش ئەوەی ژیانی هاوسەری پێکدێنێ، دەبینێ هاوسەرەکەی لەگەڵ دایکی ناگونجێ، سەرەنجام دایکی لە ماڵ دەردەکا، بەڵام بۆ ئەوەی ڕێگەی هاتنەوەی لێبگرێ

ـەیبات بۆ دەرەوەی شار و لە کەناری دەریا فڕێی دەدا و نامەیەکی بۆ دەنووسێ و دەیدا بەدەستییەوە.

پاش ماوەیەك کۆمەڵێ گەشتیار دەچن بۆ کەناری دەریاکە و دەبینن پیرەژنێکی پاك و خاوێن لە پەنایەکدا پاڵی داوەتەوە و خەریکی یاد و زیکری خوایە، ئەوانیش سڵاوی لێدەکەن و لێی دەپرسن: دایەگیان چۆن بە تەنیا لێرەیت؟ وتی: کوڕەکەی خۆم پێش ئێوە هێنامیە ئێرە و وتی دێمەوە بەدواتدا و ئەم نووسراوەیشی دایە دەستم، ئەوانیش نووسراوەکەیان لێوەرگرت و خوێندیانەوە، دەبینن نووسراوە:

(بە دایکم وتوە دێمەوە بە شوێنتدا، بەڵام چاوبەستم لێکردووە و نایەمەوە بەدوایدا، هەرکەس یارمەتی دەدا کەیفی خۆیەتی، بەڵام بەهیچ شێوەیەك نەیهێنێتەوە بۆ ماڵی ئێمە).

بۆیە ئەوانیش نان و خواردنیان پێدا و ئێوارەش وتیان: دایەگیان لێرە بە تەنها تووشی ناڕەحەتی و گرفت دەبی، بەڕاستی کوڕەکەشت لەو کاغەزەدا ئاوهای نووسیوە و درۆی لەگەڵ کردوویت.

کابرا دەڵێ زۆرمان لەکەڵ وت هەتا بڕوای کرد، هەر دەیوت: رۆڵە ئەوە کوڕی خۆمە، نۆ مانگ لە سکی خۆمدا هەڵم گرتووە و گیان و لاشەی خۆم کردۆتە قوربانی و چەند خۆشمویستووە، چەند سەرما و گەرما و غەم و پەژارە و شەونخوونیی و کوێرەوەرییم لە پێناویدا چەشتووە، چۆن ئاوا بە ئاسانی وازم لێدێنێ و فڕێم دەدات؟!

وتیان: بەخوا ئەو درۆی لەگەڵ کردوویت، بەڵام ئێمە درۆت لەگەڵ ناکەین، ناچار بە نیوە قەناعەتەوە ڕازی بوو لەگەڵمان بێتەوە بۆ ناو شار و ئێمەش بردمانە (خەڵوەتگەی پیری) و ناونیشانی خۆیشمان دایە خەڵوەتگە، دوای نزیکەی ساڵێك هەواڵیان داینێ کە کارمەندانی خەڵوەتگە داوای ئامادەبوونی ئەو کەسە دەکەن کە ناونیشانەکەی لە لایان دانراوە.

کە چوونە خەڵوەتگەکە و خۆی پێناساندن، وتیان: ئەو پیرەژنەی جەنابت هێناوتە داوای تۆ دەکات، منیش چوومە سەردانی و هەواڵیم پرسی، زۆر نەخۆش و بێکەیف بوو، لە نەخۆشیی مردن دەچوو، وتی: کوڕم تۆ بۆ منت هێنایە ئێرە، وتم: وەڵڵا لەبەر خوا، وتی: دە تۆ ئەو خوایە هەواڵ بدە کوڕەکەم تا بێت بۆ ئێرە، ئەوەك بمرم، سێ جار بە سوێند ناردمی، تەلەفونم کرد بۆ کوڕەکەی، بەڵام لە جاری سێهەم دا کوڕەکەی تورە بوو، وتی: (کاکە وازم

لێبێنە ئەگەر مرد، شارەوانی خۆی دەینێژێ، ئیتر تۆ بۆ واز ناهێنی) تەلەفونەکەی بەسەردا داخستمەوە.

منیش قسەی کورەکەم بۆ دایکی گێرایەوە و ئەویش دەستی کردە گریان و بە کوڵ فرمێسکی دەڕشت، وتم: دەی کە کورەکەت حاشات لێدەکات، من کوڕی تۆم، چیت دەوێ لە خزمەتت دام، وەك دایکی خۆم، دەڵێ: زیاتر گریا، بۆیە منیش سوێندم دا وتم: دەبێ پێم بڵێی تۆ لەم کاتەدا کە زۆر بێتاقەتی کورەکەت بۆ چیە؟ بە من بڵێ با ئەو پێویستییەت بۆ جێبەجێ بکەم، بەدەم گریان و فرمێسك ڕشتنەوە وتی: بە خوا ڕۆڵە بە تۆ جێبەجێ ناکرێ.

دووبارە سوێندم دا کە پێم بڵێ کورەکەی بۆ چیە؟ دەڵێ وتی: وەڵلا من کە ئێستا لەسەرەمەرگدام نزیکەماڵئاوایی لە دونیا بکەم، دەمویست کورەکەم بێت و (أضمه الي صدري وأعفو عنه)، واتە: دەمویست بیگوشم بە سنگمەوە و گەردنی ئازاد بکەم، ئەترسم خوا لەسەر من سزای بدات !!

دایکان کاتێك دڵیان دەربارەی منداڵەکانیان ئارام دەبێت و ئۆقرە دەگرێت کە لە بەهەشتی خوادا کوڕ و کچەکانیان لەگەڵ خۆیان دەبینن و دەزانن مردن سەر بڕاوە و کەوتنە خوارەوە و سەیارە لێدان وسووتان و پێوەدان و نەخۆشیی و دەرد و بەڵا و ئێش و ئازار و ئەشکەنجە نەماون، گرتن و فڕاندن و فەوتان و تۆقاندن و بێسەروشوێن بردن، نەماوە و گرتووخانەکان بەسەر خاوەنەکانیاندا ڕووخاون، ئەو کاتە هەناسەی ئاسوودەیی و بێغەم و هەنسك هەڵدەمژن.

لێرەدا هەست و میهرەبانیی دایکێکتان بۆ دەکەمە دیاریی، کە خۆم لە پرسە و کۆڕی دڵخۆشیدانەوەکەیدا دانیشتبووم، ئەم دایکە تەنها پێنج ڕۆژ بوو کوڕێکی جوانی گەنجی ڕەوشتبەرز و خواناسی بە ناهەق و بەبێ هۆ و بەستەم و دەستدرێژیی کوژرا، خەڵکی ئارمردەی سەر بە شاری بانەی کوردستانی ڕۆژهەڵات بوو، کەسێکی عێراقی بە ناهەق کوشتبووی، دوای پێنج ڕۆژ مەحکەمە دایکی کوڕە کوژراوەکەیان بانگکرد بۆ لێکۆڵینەوە و وەرگرتنی ڕای دایکی دەربارەی بکوژەکە، منیش دەستم کرد بە دڵخۆشیدانەوەی ئەو دایکە بەڕێزە، لە گەرمەی قسەکانی مندا هەناسەیەکی هەڵکێشا و وتی: بە خوا جەماعەت، لەو کاتەوە خەبەری کوژرانی کوڕە جوانەمەرگە تەمەن (١٨) ساڵەکەم بۆ هات، هەتا چوومە

سەر تەرمەکەی و هەتا ئێستاش کە بەرەو ڕووی ئێوە قسە دەکەم دڵم نەهاتووە دوعای مەرگ لە بکوژی کوڕەکەم بکەم، وتم: با ئەو دایکەش کە من نازانم کێیە وەك من جەرگ و دڵی نەسوتێ و مەرگی کوڕی نەبینێ.

# کوڕە لاسارەکەی دوای مردنی دایکی دووچاری نەخۆشیەکەی دایکی بوو

**مامۆستا عەبدولعەزیز هەولێریی دەگێڕێتەوە:**

ماوەی حەوت ساڵ بوو لە ئەمەریکا دەژیام، لەو ماوەیەدا کە لە وڵاتی غەریبی بووم، ئەگەر کوردێکم ببینیایە دڵم پێی دەکرایەوە، بە تایبەت ئەگەر خواپەرست و حەڵاڵ و حەرامزان بووایە و چاکە و خراپەی بزانیایە.

بەڵێ کوڕێك بووە هاوڕێم کە دایکێکی پیری کەنەفتی لەگەڵدا دەژیا، کە دوچاری نەخۆشییەك بووبوو پێشتر وێنەی ئەو نەخۆشیە نەبووە، بە جۆرێك بوو ئەگەر ڕۆژی چەند جار بیانشۆردایە وات دەزانی ساڵەوەختێکە خۆی نەشۆردووە، بۆنێکی زۆر ناخۆش وبۆگەنی لێدەهات، دواتر وردە وردە بەهۆی هاتوچۆ و ناسیاوەتی زیاترەوە بۆم دەرکەوت ئەم دەردەدارە کوڕێکی تریشی هەیە و ئەویش لە هەمان شار ژیان بەسەر دەبات، جارجارە دەمبیست لە دەرگاوە لوتی خۆی دەگرت و سەلامێکی لە دایکی دەکرد و دەستبەجێ خوا حافیزی لێدەکرد، دوای لێکۆڵینەوە و ڕەد و بەدەل، بۆم دەرکەوت خۆی و ژنەکەی بێز لە دایکی دەکەنەوە و هەرگیز بۆ جارێکیش نایبەنە ماڵی خۆیان و ئەگەر کەسێکیش ئامۆژگاریی بکردایە قسەکەی لە دەمی دەسەندەوە و دەیوت: کاکە دەتەوێ ماڵەکەم لێ بشێوێنی؟ بە خوا خێزانم دەڵێ، یان من، یان دایکت، خۆیشم تەبیعەتم باش نییە.

چەند جار ئامۆژگاریی کرا، بەڵام بێسوود بوو، زۆر جار ترسێنرا بە سزای خوا، بە ئاهوناڵەی دایك، بە سنگ کوتان و خەم و پەژارە و گریوتینی دەروونی دایك، بەڵام لەم گوێچکەوە نەیبردە ئەو گوێ، کوڕە چاکەکەی تریشی هەموو ڕۆژێك، یان ڕۆژ ناڕۆژێ دایکی دەشۆرد و جل و پۆشاکی بۆ دەگۆڕی و بۆنی خۆشی لێدەدا، ئەم کوڕەیان زۆر چاك بوو لەگەڵ دایکی و کوڕێکی خواناس بوو، دووکەڵی عەلمانییەت و دنیاپەرستی دڵی ڕەش و چاوی بێ تین و دەروونی تاریك نەکردبوو.

هەتا ڕۆژێك هەواڵیان دامێ کە دایکی دوو کوڕەکە نەخۆشە و هیلاکە، ئێمەش بەپێی شەرعی ئیسلام و دابونەریتی کوردیی چووینە ماڵیان، لەگەڵ ئەواندا چاوەڕێی مەرگی پیرەژنەکە بووین و ئافرەت و خێزانەکانیشمان لەگەڵ خۆمان برد، کوڕە لاسارەکەش لە ژوورێکی تر لە ناو خەڵکەکەدا دانیشتبوو.

دوای گیان سپاردنی نەخۆشەکە، ئافرەتەکان دەستیان کرد بە شۆردنی و ئێمەش کفن و پۆشاکی ناو گۆڕمان بۆ ئامادە کرد، لەگەڵ لێبونەوەی ئافرەتەکان لە شۆردنی تەرمەکە وکفن کردنی، لە ژوورەوە دەنگە دەنگ پەیدا بوو، خێرا چووینە ژوورەوە بۆ لای کوڕە لاسارەکە، کە ئامادە نەبوو لە کفنکردنی دایکیشیدا بەشدار بێت، هەموو بە چاوی خۆمان بینیمان نەخۆشیەکەی دایکی پەڕیوەتە لاشەی کوڕە لاسارەکە، دواتر وردە وردە خەڵکی و برا دەر و دۆست و ئاسیاو لێی تەکینەوە، تا سەرەنجام هاوسەر و منداڵەکەشی وازیان لێهێنا و بە تەنیا لە ماڵەکەیدا ژیانی بەسەر دەبرد.

دایکی بەبەزەیی نەیدەزانی کوڕەکەی لەسەر ئەو دووچاری ئەو نەخۆشییە دەبێت، دەنا بە دڵی پڕ میهر و سۆز و بەزەیی و چاوی پڕ فرمێسك داوای لە خوا دەکرد کە کوڕەکەی لەسەر ئەو دووچاری هیچ ناخۆشیەك نەبێت و تەنانەت دڕکیش نەچێت بە پێی دا.

من دەڵێم لەم ئایەتە ڕامێنە و لێی وردبەرەوە، (( فاعتبروا یا أولی الابصار))، ئەی خاوەن چاوەکان پەند وەرگرن.

# کاتێک لەگەڵ دایکی ئاشتبووەوە خوا منداڵی پێبەخشی

هەمان مامۆستا عەبدولعەزیز هەولێریی گێڕایەوە کە بەسەرهاتی بۆ گێڕامەوە، بە چاوی خۆی بینیویەتی، دەڵێ:

هەر لەو ماوەیەی کە لە ئەمەریکا بووم کوڕێکم دەناسی لەگەڵ دایکی زۆر خراپ و بێڕێز و بێویژدان بوو، دایکیشی بێوەژن بوو، تەنها ئەو کوڕە و کوڕێکی تری شك دەبرد، تەواوی کەسوکار و خزمانی لە کوردستان بوون، بەڵام ئەو کوڕەی تریان هەقی کوڕە خراپەکەیشی بۆ کردبووەوە، زۆر باش بوو، هەمیشە لە خزمەت دایکیدا بوو، کوڕە خراپەکە منداڵی نەدەبوو، زۆر هەوڵی دابوو هەر پزیشکێکیان بۆ هەڵ بدایە خۆی دەگەیاندێ و داوای چارەسەری لێدەکرد، بەڵام بێسوود بوو، لە میانەی گەڕان بە دوای چارەسەر و دەرماندا کوڕەکەمان بردە لای مامۆستایەکی ئایینیی (فلیپینی) و داوای چارەسەرو دوعای خێرمان لێکرد، مامۆستاکە یەکسەر وتی: کوڕم هەرچیم لێپرسیت بە ڕاست و دروستیی وەڵامم بدەرەوە، پاشان وتی: کوڕم دایك و باوکت لە ژیاندان؟ کوڕەکە وتی: مامۆستا باوکم مردووە، بەس دایکم ماوە، مامۆستا وتی: لەگەڵ دایکتدا چۆنی؟ باشیت؟ لێت ڕازیە؟ خزمەتی دەکەی؟ دڵی ئازار نادەی؟

کوڕەکە تۆزێ ملی بادا و لەبەر ئێمە، یان بەڵێنەکەی کە بە مامۆستای دا نەیوێرا درۆ بکات، بۆیە وتی: وەڵڵا بڵێم چی؟، بە خوا زۆریش لەگەڵیدا باش نیم، ناگونجێ من دایکم ببەمە ماڵی خۆم، لەگەڵ ژنەکەمدا ناگونجێ، بە خوا دایکم خەفەتیشم زۆر لێدەخوات و لای خەڵکی دەردەدڵیم لێدەکات.

مامۆستا وتی: بەسە کوڕم تێگەیشتم، چارەسەری تۆ ئەوەیە لەگەڵ دایکتدا ئاشت بیتەوە، دەستی ماچ بکەی و داوای لێبوردنی لێبکە، من پێموایە ڕازیکردنی دایکت و سارێژکردنی زام و ناسۆری دڵی دەبێتە هۆی منداڵبوونتان، چونکە بوونی منداڵ تەنها بە دەست خوایە و هەر کەسیش دایکی لێی ڕازی بێت ئەوا خوایشی لێ ڕازی دەبێ، هەر کاتێکیش خوای لێ ڕازی

بێ منداڵی پێدەبەخشێ و نزاو پاڕانەوەی گیرا دەکات و دەروی خێری لێدەکاتەوە، دەڵێ هەستاین و خواحافیزییمان لێکرد، ئێمەش زۆر هانی کوڕەکەماندا کە ئامۆژگارییەکانی مامۆستا جێبەجێ بکات، بەڵێ بە ناچاریی ڕازی بوو لەگەڵ دایکی ئاشتبووەوە، هەر دوو دەستی دایکیمان پێ ماچ کرد و دایکیشی بە سنگیەوە گوشی و گەردنی ئازاد کرد وماچی کرد و فرمێسکی سۆز و بەزەیی دایکانەی بۆ داباراند، ئیتر پێش گەڕانەوەم بۆ کوردستان بە چاوی خۆم بینیم ئەو کوڕە بووە خاوەنی چوار منداڵ.

ئیتر بەردەوام لە خزمەت دایکیدا بوو، هەموو لاپەڕە ڕەشەکانی ڕابردووی سڕیەوە، دایکیشی بەردەوام دوعای خێری بۆ دەکرد و منداڵە چاوگەشەکانی کوڕەکەی لە باوەش دەگرت.

# فەرمانی دایکم واجبە و دەرس وتنەوە سوننەتە

زانایەکی ناودار لە گەرمەی دەرس وتنەوەیدا بە قوتابیەکانی، دایکی لەبەر پیری و نەخۆشی هەندێك خەڵەفا بوو، بانگی کرد بە ناوێك کە زۆریش خۆش نەبوو بەو جۆرە بانگ بکرێ، جا ئەو کوڕ و دایکە یەك مریشکیان هەبوو، لە باڵەخانە و قاتی دووەمەوە بە دەنگی بەرزەوە هاواری لە کوڕەکەی کرد، هەستە برۆ دان بدە بە مریشکەکە، زانای خواناسیش یەکسەر بە قوتابیەکانی دەڵێ: ئێوە خواتان لەگەڵ و بە خواتان دەسپێرم، دەرس وتنەوەکە سوننەتە، بەڵام بەگوێکردن و گوێڕایەڵیی دایکم فەرزە، دەرسەکەی جێهێشت و چوو بۆ جێبەجێکردنی فەرمانەکەی دایکی.

زانست و خواپەرستییەکەی فێری ئەوەیان کردبوو کە ئەوپەڕی ڕێز بگرێ لە فەرمانی دایکی، دوای فەرمانی خوا و پێغەمبەر (ﷺ)، بەڵکو ڕاستەوخۆ دوای خواپەرستی دەبێ فەرمانی دایك و باوکی جێبەجێ بکات و چاکەیان لەگەڵدا بکات، خۆ ئەگەر فەرمانی دایك و باوکی چاك و شەرعیی نەبوو، دەتوانێ بە گوێیان نەکا، بەڵام نابێ زویریان بکات و پیایان هەڵشاخێ.

زانایان ڕازی نەبوون لە قاتی سەرەوە بخەون و دایکیان لە قاتی ژێرەوە بێت و بە بێئەدەبیی و بێڕێزییان زانیوە، لە ناو زانایاندا کەسی وا هەبووە لە دوای مردنی باوکی حەوت ساڵ لە خزمەت دایکیدا بووە، دەفەرموێت هەتا دایکم مرد لەگەڵ ئەودا لە یەك قاپدا نانم نەخوارد، وتیان: بۆ؟ فەرمووی: ترساوم دەست بۆ پارویەك بەرم کە دایکم چاوی تێبڕیوە و حەزی لێیەتی، بەو هۆیەوە خوا غەزەبم لێبگرێ.

ئیبنوسیرین دەفەرموێ: چەند ساڵ لە خزمەت دایکمدا بووم ناوچاوانیم نەبینیوە، وتیان: بۆ؟ وتی: دایکم بە شاژن و خۆم بە خزمەتکار و ڕەنجبەر داناوە، بێئەدەبیشە خزمەتکار لە ناوچەوانی شاژنی خۆی وردبێتەوە.

# نزاو پاڕانەوەی پیرەژنە ستەملێکراوەکە یەکسەر گیرا بوو

**لە کتێبی (صحیح وصایا الرسول)دا هاتووە:**

پیرەژنێکی بێکەس و بێخانە و لانە هەبوو، داماو و لێقەوماو و زەبوون و دەستکورت، خەڵکیی یارمەتییان ئەدا، لەو تەمەنەدا پێویستی بە یارمەتی و دڵڕاگرتن هەبوو، کەسی نەما بوو تا خزمەتی بکات و دەردو پەژارەو ئازاری پیری لەسەر کەم بکاتەوە، داوای لە کەسانی خێرخوا کرد کوخێکیان بۆ ساز کرد بە دار و بەرد و چیلکە و پەڕۆ و پاتاڵ، لە زەویەکی چۆڵدا، پیرەژنەکە هەناسەی ئاسودەیی تیا هەڵمژی و ئەو کولانەی نەدەگۆڕیەوە بە قەسری قەیسەر، ئەوەندە دڵی بەو کوخە خۆشبوو هەستی بە سەرمای زستان و گەرمای هاوین نەدەکرد، بە ڕۆژ وەکو باڵندە بە چیکڵدانی بەتاڵ دەچووە دەر و ئێوارە بە چیکڵدانی پڕ دەگەڕایەوە و شەویش زەوی ڕادەخست و ئاسمانی بە خۆیدا دەدا و پاشای بە گەدا و خزمەتکار ڕانەدەگرت.

پاشای سەردەم دار و دەستەکەی کۆکردەوە و بە هەموویان بڕیاریاندا لەو زەویە بەر بەرەلایەدا کۆشکێکی ناوازە بۆ پادشا ساز بکەن و بیڕازێننەوە، بەڵێ بڕیار دەرچوو هەموو دەست وپێوەند و دار و دەستەی پادشا کەوتنە سەر قاڵی و شەو و ڕۆژیان خستە سەر یەك بۆ ڕەزامەندیی پاشا و بە ماوەیەکی کەم کۆشکیان ڕازاندەوە و بووە جێی سەرنج و تێڕامانی خەلکیی، کاتیان دیاریی کرد پاشا بێت خۆی ببینێ بزانێ دلگیرە، یان نا؟، کاتێك پاشا هات و لێی ورد بووەوە و سەرنجی دەوروبەری کۆشکی دا بینی قۆخەڵە شڕەیەك کە بە پەڕۆو پاتاڵ ساز کراوە و دەڵێی قسلە کۆنی شەخسە لە تەنیشت کۆشکەکەی دایە، پاشا زۆر تووڕە بوو وتی: ئەمە چیە؟ وتیانك قوربان پاشای گەورە، ئەوە شوێنی حەوانەوەی پیرەژنێکی بێکەس و بێدەرەتانە، پاشا فەرمانی پاشایانەی دەرکرد، هەر ئێستا هەتا خۆم لە کۆشکدام دەبێ لای بەرن و بیسڕنەوە، نامەوێ شتی وا کۆشکەکەم ناشرین بکات.

کوخ و ماڵی پیرەژنەیان وێران کرد و شوێنەکەیان تەخت کرد و ڕایانماڵی، کە پیرەژن گەڕایەوە لە بازاڕ، گەڕا بەو ناوەدا، دەبینێ ماڵ نەماوە، دەستێکی بە چاویدا هێنا و ئەملاو ئەولایەکی کرد، شوێن نەماوە، پرسیاری کرد، وتیان: پاشا فەرمانی کرد بە وێرانکردنی وخۆیشت دووریکەوە با تووشی گێچەڵێك نەبی، پیرەژن هیچ دەسەلاتی نەبوو، ئەوەندە نەبێ دەستی بەرز کردەوە و وتی: من لە بازاڕ و دەرەوە بووم، فأين أنت يا رب السماء؟، ئەی تۆ لە کوێ بووی، ئەی پەروەردگاری ئاسمان؟

دەستبەجێ کۆشکەکە بە پاشا و سەرباز و لەشکرەوە بە زەویدا ڕۆچوو.

# عوسه سەرخۆش

# چۆن بوو بە حاجی عوسمان؟

**ئەم بەسەرهاتە لە سەرەتای هەشتاکاندا بوو:**

ژیانی دونیا هەمووی تاقیکردنەوەیە، بە خۆشیی و ناخۆشییەوە، بە ساغی و نەخۆشییەوە، بە دەوڵەمەندیی و هەژارییەوە، بە سەرجەم حاڵەت و گۆڕانکاریی قۆناغەکانی، لە هیچ شوێن و کات و ساتێکیشدا خوای گەورە دەست لە بەندەکانی بەرنادات بۆ چاوتروکاندنێکیش، بەردەوام لە قۆناغێك و حاڵەتێکەوە دەیانگوێزێتەوە بۆ قۆناغ و حاڵەتێکی نوێ، بەڵکو پەند و ئامۆژگاریی وەرگرن و تەوبە بکەن و بە چاکیی بچنەوە بەردەم پەروەردگاریان، ئەم پیاوەش یەکێك بوو لەو کەسانەی لەسەرەتای گەنجێتیەوە دووچار و گرفتاری مادە سەرخۆشکەرەکان بوو بوو، بەتایبەت ئارەقخواردنەوە.

هەموو رۆژێك، هەموو شەوێ بە سەرخۆشیی و بێهۆشیی دەگەڕایەوە ناوماڵ و منداڵی، لە کاتێکدا منداڵ چاوەڕێی باوکیانن بە ڕووی خۆش و زەردەخەنەوە و بە دەستی قورسەوە بگەڕێتەوە ناویان، بەڵام نەیانبینی بە سەرخۆشیی نەبێ، ژنی داماو بە ئاواتەوە بوو هاوسەرەکەی رۆژێك بە ئاقڵی و بیر و هۆشەوە بگەڕێتەوە و لەگەڵ میوانێکدا دوو قسەی ژیرانە بکات، تەنها جارێك بە زمانی شیرین و دڵی نەرم و زەردەخەنەوە بیدوێنێ و بزانێ ئەم پیاوە بە ئەندازەی فلسێك خۆشی دەوێ، بەڵام نەیبینی.

هەر بە سەرخۆشیی و مەست و بێهۆشیی دەگەڕایەوە و وەکو سیپاڵ خۆی دەدا بەسەر جێگەکەی دا و زۆر جاری وا هەبوو پێخەف و پۆشاکەکانی خۆیشی پیس دەکرد، ئەم حاڵە چەند ساڵی خایاند، منداڵەکان بۆ دایکیان دەگێڕایەوە: هاوڕێکانمان دەڵێن باوکمان شتی جوانمان بۆ دەکڕێ، خواردنی خۆش، جلی جوان، پێڵاوی تازەمان بۆ دێنێتەوە، باوکمان یارییمان لەگەڵ دەکات و دەمانبات بۆ سەیران و گەڕان، دایە گیان ئەی باوکی ئێمە بۆچی وەکو باوکی هاوڕێکانمان ناکات؟ دایکی کلۆڵ و داماو زیاتر خەفەت و پەژارە دایدەگرت،

بەڵام چاری نەبوو تەنها هەناسەی قوڵی خەفەتاوی هەڵدەمژی، هەتا شەوێك عوسمان نیوەشەو بەسەرخۆشیی هاتەوە و یەکسەر خۆی کرد بە ژوورەکەی خۆیدا، لەسەر پێخەفەکانی بە دەما خۆیدا بە زەویدا.

خێزانەکەیشی هیچ گوێی نەدایە، خوا خوایان بوو لە شەڕی بەدوور بن، خێریان لێی نەدەویست، پێش نوێژی بەیانی

- وەکو هاوسەرەکەی گێڕایەوە - وتی: هەستام نوێژی بەیانی بکەم، دەستنوێژم گرت و سەیری ژوورەکەی عوسمانم کرد، تەماشام کرد عوسمان لەسەر بەرماڵ ڕوو بە قیبلە دانیشتووە و دەگری و دەپاڕێتەوە لە خوا، وتم: عوسە ئەوە چیە؟ هەر بەرماڵەکە مابوو پیسی بکەی؟ وتی: ژنەکە بەخوا بەڕاستمە، وتم: تۆ شەو سەعات دوانزە بە سەرخۆشیی هاتوویەوە، جا توخوا ئێستا ئاگات لە خۆتە و ئەزانی چی دەکەی و چی دەڵێی؟ وتی: ئەرێ وەڵڵا چاك ئاگام لە خۆمە و چاکیش ئەزانم چی دەکەم وچی دەڵێم، وەرە دانیشە، ژنەکەی دەڵێ: لە نزیکەوە دانیشتم وتی: (ئافرەت، دوای ئەوەی شەو بە سەرخۆشیی هاتمەوە یەکسەر خەوم لێکەوت، لە خەومدا پێشەوا عومەری کوڕی خەتتابم بینی، زۆر ترسام لە گەورەیی و سامی ئەو پیاوە گەورەیە، بەڵام بە ڕووی خۆش و زمانی شیرین بانگی کردم، بەدەستی پیرۆزی خۆی سێ قوم ئاوی دامێ، ئەو هەڵوێستە و ئەو قومە ئاوانە ئەوەندەیان کار تێکردم یەکسەر دەستم کردە گریان، کە خەبەرم بووەوە فرمێسکەکان بە چاومەوە بوون، هەستام خۆم شۆرد و دەستنوێژم گرت، لەو کاتەوە شەونوێژ دەکەم).

لەو شەوەوە لەسەر شەونوێژ بەردەوام بوو، بەڵێ: هەر هەمان ساڵیش عوسە سەرخۆش چوو بۆ حەجی ماڵی خوا و حەجی کردو بوو بە حاجی عوسمان.

# لەئینتەرنێتەوە

ئەم پیاوە لە شاری ریاز دادەنیشێت، دەڵێ: سێ شەو لەسەریەك خەوم بینی، لە خەودا ناوی پیاوێکیان پێدەوتم: دەیانووت برۆ لەگەڵ خۆت ببیە بۆ عەمرە، دەڵێ منیش بە ناونیشان دۆزیمەوە، پیاوێکی عەبوسی ناشرینی ناوچەوان گرژ، لە عارەقخۆر دەچوو، نەمدەناسی، خەوەکەم بۆ گێرایەوە، وتی: من نیازی عەمرەم نییە، دەڵێ زۆرم لێکرد، وتی: باشە، من یەك خەرجیی ناکەم، وتم: هەمووی لەسەر من، ڕۆیشتین، من چیم کرد ئەویش کردی، هیچ خەرجیی نەکرد، دوای تەواو بوون وتی: لێمگەڕێ با دوو ڕکات نوێژ لە کەعبە بکەم، وتم باشە، بەبێنەوەی نەخۆش بێت، یان ئازاری هەبێت نوێژی دابەست، لە سوژدەدا هەڵنەسایەوە، دوای ماوەیەك دەستم لێدا بینیم لە سوژدەدا گیانی سپاردوە، تەلەفونم بۆ ژنەکەی کرد و هەواڵەکەم بۆ باس کرد، وتی ئەم هاوسەرەم عارەقخۆر و نوێژنەکەر بوو، بەڵام خراپەی بۆ ئێمە نەبوو، بەڵکو زۆرجار کە لە خواردنەوە دەبووەوە خواردنی خۆشی بۆ ئێمە دەهێنا، بێوەژنێکی دراوسێشمان، دوو سێ منداڵی هەتیوی هەبوو، لەگەڵ خۆماندا چ خواردنێکی بۆ ئێمە بهێنایە بۆ ئەو بێوەژن و منداڵە هەتیوانەشی دەهێنا، لە دەرگاکەوە دەیدایە دەستیان ئینجا دەهاتە ژوورەوە، وتم: دەی پیرۆز بێ تەوبەی کرد و عەمرەی کرد و لە نوێژدا مرد و تەرمەکەی بە ئاوی زەمزەم شۆراو لە مەککە نێژرا، هاوسەرەکەشی وتی: خوا لێی خۆشبێت و ئەو مردنەشی پیرۆز بێت.

# سێ مانگ جوێنم پێداو دوایی لەسەر دەستی ئەو تەوبەم کرد

**لەساڵی (٢٠٠٧ز) (١٤٢٨ کۆچی) بە بۆنەی سەفەری حەج کردنم لە ڕێگەی ئێرانەوە شەش ڕۆژ لە تاران ماینەوە، ئەم بەسەرهاتەیان لەوێ بۆ گێرامەوە.**

دوای ڕووخانی ڕژێمی شای ئێران و دامەزراندنی حکومەتی تازە، جۆرێك لە ئازادییمان بە خۆمانەوە بینی، لە شاری سنەش پیاوێك دەرکەوت و سەری هەڵدا کە پێشتر وەکو مەلا و پیاوخوا ناسرا بوو، بەڵام لەسەرەتای شۆڕشی ئێراندا لە ساڵەکانی (١٩٨٠) بەدواوە، وەکو پیاوێکی زۆر زانا و سیاسەتمەدار و کۆمەڵناس و پێشەوا سەری هەڵدا، هەڵبەت لە لای زۆرینەی خەڵکی، بەڵام بەشێکی کۆمەڵگە لە خەڵکی کوردستانی ڕۆژهەڵات کە گەرای فیکرە گەندەڵ و مرۆڤ فیکرەکان، لە خشتەیان بردووین، بەدوا کەوتوو و بە بەکرێگیراومان دەزانی، وا فێر کرابووین کە ئەمانە و فیکر و بەرنامەی ئەمانە کوردیان بەرەو دوا هێناوە و گێڕاویانەتەوە بۆ دەوری بەرد و سەدە تاریکەکان، جا هەر کات دین و مزگەوت و خوا پەرستیی و خوا پەرستان لە ناو گەلی کورد و نیشتیمانی کورد ڕیشەکێش کران، کوردیش وەکو گەلانی تر پێشدەکەوێ و ڕزگارمان دەبێ، ئێمە کوێرانە لە دیدی ئەو بیروبۆچوونە نەزۆك و لە ڕوانگەی ئەو چاویلکە تەڵخ و ژەنگاوی و چەپەڵەوە دەمانڕوانی بۆ ئیسلام و موسڵمانان.

منیش خزمەتێکم بە گەل و نیشتیمانی خۆم پێنەدەکرا، جگە لەوەی ڕۆژانە چارەکە سەعاتێك تا بیست خولەکێك بە تەلەفون جوێن و قسەی ناشرین و ناشایستەم ئاڕاستەی کاك ئەحمەدی موفتی زادە دەکرد، بەم شێوەیە زیاتر لە دوو مانگ و نیو بەردەوام بووم، قسەکانی من بۆ گێڕانەوە ناشێن لەبەر ناشرینی و نابەجێی، ئەگەر بکرایەتە سەر نان، سەگ بۆنی پێوە نەدەکرد، بەڵام ئێستا ئەم پیاوە کە ئەم بەسەرهاتە دەگێڕێتەوە، هۆن هۆن

فرمێسکی خەجاڵەتی و پەشیمانیی لە چاوانیدا دەباریێ، لە درێژەی قسەکانیدا و لە کاتی گێڕانەوەی بەسەر هاتەکەیدا دوای هەناسەیەکی قوڵ وتی:
(کاك ئەحمەدیش هەموو جارێ دوای ئەوەی من لێدەبوومەوە، دەیفەرموو: برا گیان تەواو بوویت؟ ئیشت نەما؟ ئەم ووت: هیچی تری خراپم لە بیر نییە پێتی بڵێم، ئینجا بە دەنگێکی نەرم کە هەرگیز لە یادم ناچێت، دەیفەرموو: کاکە گیان من زۆر لەوە خراپترم کە تۆ دەیزانی، خوا باش من دەناسێ ئەگەر تۆش باش منت بناسیایە زۆر خراپترت پێ دەوتم: چونکە شایستەی خراپترم).
ڕۆژێکیان بیرم لەوە کردەوە کە پیاوە گەورەکانی ئێمە هەرگیز بە خۆیان ناڵێن خراپ و هەر وەسفی خۆیان دەکەن، زۆر کەیف خۆش دەبن و باڵا دەکەن کە خەڵکی پیایاندا هەڵدەڵێن، کەسێکیش هەڵەیەك بکات لە ڕوویاندا بازنەی سووری بە دەوردا دەکێشن، بۆیان بکرێ منداڵەکانیشی لە ناودەبەن، ئەی ئەم پیاوە بۆ وانییە؟، لەو کاتەدا لە دڵی خۆمدا وتم: ئەرێ ئەم پیاوەی ئەم هەموو هێرشە نارەوایەی دەکەمە سەر، چیای سەخت و سەرکەشە، یان زنجیرە چیای کوردستانە، کەژی کەلیخانە، چۆن ئەوەندە خۆڕاگرە؟! دە بەخوا دەبێ سەردانی بکەم و بیبینم، وا دیارە پیاوێکی زۆر گەورە و مەزنە.
بەڵێ چوومە بازار بۆ دوکانی گوڵفرۆش، گوڵێکی جوان و گران بەهام هەڵبژارد کە شایستەی ئەو پیاوە گەورەیە بێت کە نزیکەی سێ مانگە بە هەر وشەیەکی خراپ کە زانیبێتم بۆم نەلەخشاوە، گوڵەکەم هەڵبژارد و ڕۆیشتم بە ترس و لەرزەوە، کاتێك لە دەرگامدا زۆر بەگەرمی فەرمووم لێکرا، چوومە ئەو ژوورەی کاك ئەحمەدی لێبوو، سەلامم کرد و گوڵەکەم لەبەر دەمی دانا و ویستم قاچ و دەستی ماچ بکەم، بەڵام نەیهێشت، هەرچۆنێ بێ ئەملاولام ماچ کرد و وتم: قوربان دەمناسی؟ سەری بەرز نەکردەوە و لەبەر خۆیەوە فەرمووی: (ئەرێ خەڵکینە چۆن کەسێك ناناسم کە نزیکەی سێ مانگە هاوڕێمە و هەموو ڕۆژێك بیست خولەك پێکەوە قسە دەکەین!).
لەو کاتەوە هەستم کرد لەبەردەم پیاوێکی زۆر گەورە و پایەداردا دانیشتووم و تاوانەکەیشم زۆر گەورەیە، کە بێئەدەبیم بەرامبەر ئەو زانا گەورەیە کردووە، ئینجا فەرمووی: ئەو گوڵە هەڵگرە بیبەرەوە بۆ دوکانەکە و پارەی گوڵەکەم بۆ بێنە، منیش یەکسەر بە گوێم کرد، بێ

سێ و دوو، کە چوومە بەر دوکانەکە و بە دووکاندارەکەم وت، بینیم پێی ناخۆش بوو، وتی: لە ماوەیەکی کەمدا ئەمە زیاتر لە دووسەدوپەنجا گوڵیان بۆ هێناومەتەوە، جەنابیشت بۆ کاک ئەحمەدی موفتی زادەت برد؟ وتم: بەڵێ، وتی: بە مەرجێك لێتوەردەگرمەوە، کە دوای ئەوەی پارەکەت بۆ برد، پێم بڵێی چی لە پارەکە دەکات؟ منیش بەڵێنم پێدا، پارەکەم بردەوە، لەبەر دەمی کاك ئەحمەد دامنا، وتی: کاکە هەڵیگرە، بیبە بۆ ماڵی فلان هەتیو لە فلان شوێن، ناو نیشانەکەیشی دامێ، کە چووم بۆ ماڵەکە ڕاست بوو بێوەژنێکی هەژار لەگەڵ چەند منداڵە هەتیوێك لە خانوێکی کۆندا بوون، پارەکەم دایە دەستی بێوەژنەکە و گەڕامەوە، لە ڕێوە چووم بۆ لای کابرای دوکانداری گوڵفرۆش و قسەکەم بۆ گێڕایەوە، وتی: توخوا بەجێممەهێڵە، منیش لەگەڵ خۆت ببە بۆ لای ئەو پیاوە.

بەڵێ دوو بەدوو ڕۆیشتین بۆ خزمەتی کاك ئەحمەد و هەردووکمان تەوبەمان کرد، کە پێشتر ئەندامی کۆمەڵەی ـ مارکسی ـ کوردستانی ئێران بووین و بووینە قوتابی و شاگردی دڵسۆزی کاك ئەحمەد و دوای کۆچی دوایی ئەو پیاوەش، هەر پابەندی ڕێبازەکەی و خزمەتکاری قوتابخانەکەی ئەوین.

لێرەدا خەونی خوشکێکی خۆمم وەبیرهاتەوە کە لە سەرەتای ساڵەکانی دووهەزاردا تەلەفونی بۆ کردم، وتی: خەوم بینیوە لە خەومدا پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر) ناوی دوو کەسی پێوتووم من نازانم کێن و ناشزانم ئەو خەوە چی دەگەیەنێت؟ وتم: باشە وەرە بۆ ماڵەوە، کە هات، وتی: ئەم شەو خەونم بە پێغەمبەرەوە بینی (دروودی خوای لەسەر)، سەلامم لێکرد، ویستم بچمە خزمەتی، بەڵام دوو کەسی نوورانیی لەملولایەوە دانیشتبوون، بۆیە شەرمم کرد، پێغەمبەری خوا فەرمووی: ئەم دوو پیاوە ناناسی؟ وتم: نەخێر، فەرمووی: ئەمەیان (دەستی خستە سەر شانی)، ئەحمەدی موفتی زادەیە، و ئەمەشیان (دەستی خستە سەرشانی ئەویش)، ناسری سوبحانییە، منیش ناوەکەم لە وەرەقەیەکدا نووسی تا لەبیرم نەچنەوە.

# بەهۆی مەڕەخێرەکەوە

# مارکسییەک تۆبەی کرد

لە ساڵی (٢٠٠٧) لەگەڵ ماڵێکی ناسراو چوومە سەر گۆڕستان بۆ سەر گلکۆی خۆشەویستێکیان، لەسەر گۆڕی مردووەکە کورتە وتارێکم بۆ دان و ئامۆژگاریی ودڵخۆشییدانەوەم لە ژێر ڕۆشنایی چەند ئایەت و فەرموودەیەکەدا بە گوێیاندادا.

لە کاتی گەڕانەوەماندا دوو پیاویان وتیان ئێمە مامۆستا دەگەیەنین، زۆر ئینکارییان کرد کە هەر ئێمە لە خزمەتیدا دەبین، بەڵێ سواری ئۆتۆمبیل بووین و لە ڕێگە دەستمان کرد بە قسە، بەڵام یەکێکیان کە ناوی کەمال بوو، تەمەنی لە پەنجاکاندا بوو، ئەو قسەی دامەزراند، دوای تاوێك وتی: حەز دەکەم بەسەرهاتێکی خۆمت بۆ بگێڕمەوە کە بە وتەکانی تۆدا بیرم هاتەوە، وتم: فەرموو.

زۆر بە زمانێکی شیرین و سادە دەستی کرد بە گێڕانەوەی بەسەرهاتەکە.

وتی: مامۆستا دەزانی لە کەیەوە نوێژ دەکەم؟ وتم: نەخێر. وتی: من ئەندامی کۆمەڵەی ڕەنجدەران بووم و پێشمەرگە بووم، لە زۆر شەڕ و کەمین دا بەشدارییم دەکرد و لە مردن ڕزگارم دەبوو، لەسەردەمی ئەنفالەکاندا لە ناوچەیەك لە لایەن سوپای ڕژێمی بەعسەوە گەمارۆ دراین، ماوەی دەرچوونمان نەبوو، شەومان بە سەردا هات، ئێمەش (١٢ – ١٣) کەس دەبووین، شەو زۆر هەوڵی دەرچوونماندا، کەلێنێکمان دەست نەکەوت، ناچار خۆمان حەشاردا و وتمان: بەیانی شەڕی مان و نەمان دەکەین و بە هیچ شێوەیەك خۆمان بە دەستەوە نادەین، بەهەرحاڵ ئەوەندە ماندوو بووین بە پێوە خەومان لێدەکەوت، لە پەنایەکدا خۆم مات کرد و خەوم لێکەوت، خەونێکی سەیر و سەرسوڕهێنەرم بینی.

لە نێوان قسەکانیشدا دەیووت: مامۆستا من ئەو کاتە بڕوام بە هیچ نەبوو، نە دین و نە مزگەوت و شێخ و مەلا و کەلام و کتێب، زۆر مولحید و خوانەناس بووم، وتی: لە خەوەکەمدا سوپای ڕژێم چواردەوری گرتبووین، ڕێگەی نەجاتمان نەبوو، دەستمان لە خۆمان شۆردبوو،

شەڕ و تەقە دەستی پێکرد و برادەرەکانم یەك لە دوای یەك کوژران، منیش بە لایەکدا ڕۆیشتم، مەڕێکی ڕەشم بینی وتی: شوێنی من بکەوە و دەستم پێوە بگرە ڕزگارت دەبێ و ڕێگای دەرچوونیشت پێ نیشاندەدەم، منیش شوێنی مەڕەکە کەوتم و دەستم لێگیرکرد هەتا ڕزگارم بوو.

ئیتر خەبەرم بوویەوە، هێشتا هەر شەو بوو، لە برادەرەکانم پرسی وتم: هیچی تازە نییە؟ هەواڵێك، خەبەرێك؟ وتیان: هەواڵی چی؟ منیش خەوەکەم بۆ باس نەکردن، چونکە ئەوانیش وەکو خۆم گاڵتەیان بە خەون دەهات.

بەڵام من تاسا بووم، دیمەنی خەونەکەم دەهاتە پێشچاو، خۆم گرت و قسەم نەکرد، بەیانی حکومەت دەستی کرد بە هێرشکردن، وەکو تاوە تەرزەی بەهار فیشەك بە سەرماندا داباری و ناوچەکەی بە خەستی بۆردومان کرد، هەموو برادەرەکانم تیاچوون و یەك پێشمەرگە دەرنەچوو، بەڵام من دەرچووم، چۆن دەرچووم؟ نازانم! !

دوای چەند ڕۆژێك گەڕامەوە ناوچەی ماوەت، بە پرسیار ماڵی دایکم دۆزیەوە، لە گوندێکی ئەو ناوچەیە بوو، کاتێك هەواڵیان بۆ دایکم برد، بەرەوە پیرم ڕایکرد، نزیکەی پانرە، بیست مەترێکی مابوو بگاتە من، وتی: کەمال وەڵڵاهی ئەوە مەڕەکە فریات کەوتووە و ئەمجارەش بە سەلامەتی هاتیەوە و هیچت لێ نەهات، وتم: ئەرێ وەڵڵا ڕاست دەکەیت، من مەبەستم مەڕێکە و دایکیشم مەبەستی مەڕێکی ترە و هیچیشمان ئاگامان لە یەکدی نییە، بەهەرحاڵ کە گەیشتمە بەرەوە دایکم دوای بەخێرهێنان، وتی: ڕۆڵە سێ ڕۆژ لەمەوپێش مەڕێکی ڕەشی گەورەم بۆ کردیت بە خێر! !

ئینجا خەونەکەم بیر هاتەوە و وتم: مەڕی ڕەش؟ وتی: بەڵێ کوڕم، ئەوەش کەوڵەکەیەتی هێشتا لە حەوشەکەدایە، کە تەماشام کرد ڕاست و دروست کەوڵی ئەو مەڕە بوو کە ڕێگەی نیشاندام لە خەونەکەم دا، بۆیە کە پێستەکەم بینی ڕاچڵەکیم و تەزوێك بە تەوقی سەرمدا هات و لە بنی پێم کوژایەوە.

هەر لە بینینی پێستی مەڕە خێرەکەی دایکمەوە، دەستبەجێ تەوبەم کرد ودەستم دایە خوداپەرستیی و لەو کاتەوە نوێژم نەفەوتاوە، هەر دەستبەجێ وازم لە مارکسیەت و بێدینیی هێنا و نوێژە فەوتاوەکانی ڕابردووشم هەمووی گێڕاوەتەوە.

# لە هاوڕێی خراپ چیم دەستکەوت؟

دوو پیاو کە هاوڕێی گیانی بەگیانی یەکتر بوون، یەکێکیان خواناس و چاکەخواز و ڕەفتارجوان بوو، پارێزی لە ئاوی شەوێ دەکرد، حەڵاڵخۆر و مامەڵە دروست بوو، ئەوی تریشیان بە پێچەوانەی ئەمەوە بوو، خوانەناس و خراپەکار بوو، بەسەر ماڵی خواوە نەدەچوو، لە مامەڵەی ناشەرعی و ماڵی هەتیو و ماڵی مزگەوتیش نەدەسڵەمیەوە، بەڵام سەیر و سەمەرە لەوەدا بوو کوڕی پیاوە خێرخوازەکە هەتا بڵێی ناڕەسەن و چەقاوەسوو بەدکردار و بەدڕەفتار بوو، کوڕی کابرای خوانەناسیش هەتا بڵێی خواناس و چاکەخواز و کردار و ڕەفتار جوان و زمان شیرین و ڕەوشتبەرز بوو.

ڕۆژێك کابرای خواناس دەردە دڵی خۆی لای کابرای هاوڕێی کرد وتی: ئەرێ زۆر سەیرە، من نەك حەرام، بەڵکو خۆیشم لە گومانلێکراوەکان پاراستووە، تۆش خۆت باش خۆت دەناسیت، پێویست بە تەعریف و پیاهەڵدان ناکات، بەڵام کوڕی من چۆنە و کوڕی تۆش چۆنە؟ کابراش یەکسەر وتی: دەزانی بۆچی وایە؟ وتی: نەخێر نەوەڵڵا، وتی: کوڕەکەی من بەردەوام لە ماڵی ئێوەیەو نان وخواردنی ئێوەی زیاتر خواردووە لە نان و خواردنی خۆمان، واتە: بە نانی حەڵاڵ و زوڵاڵ پەروەردە بووە، کوڕەکەی ئێوەش بەردەوام نان و خواردنی ماڵی ئێمەی خواردووە کە حەڵاڵ و حەرام تێکەڵە، بۆیە ئاوا خراپ دەرچووە، واتە: بە نانی حەرام گۆش کراوە.

ئەو کاتە کابرای خواناس بیری کەوتەوە کە پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت)، بێ حیکمەت نەیفەرمووە: ﴿لا تصاحب إلا مؤمنا، ولا يأكل طعامك إلا تقي﴾، واتە: هاوڕێیەتی مەکە لەگەڵ ئیماندار نەبێ، بە تەنها مرۆڤی خواناسیش لە نان و خواردنت بخوات، بەڵام درەنگ پێی زانی و تازە کار لە کار ترازا بوو ، دەستی لە بنی هەمانەکەوە دەرچوو، بەسەرهاتەکەیشی بۆیە گێڕاوەتەوە، تا خەڵکیی پەند و ئامۆژگاری لێوەرگرن و بەدەردی ئەو نەچن، هاوڕێی خراپ وەکو ئاگر وایە، کابرا هەزار ساڵ ئاگر بپەرستێت کە دەستی لێدا دەستی دەسوتێنێت، ئاو هەواش لە نزیك و دەوروبەری لاکە تۆپی و ڕزیو و بۆگەن پیس و بۆگەن دەبن.

# باوکی خۆی دابەستبوو ئاوی پێ هەڵدەگۆزت

**لە زمانی خواناسێکەوە گێڕدراوەتەوە:**

زۆر ماندوو شەکەت بووم، لە دوورەوە تارماییەکم بینی زانیم ئاوەدانییە زۆر کەیف خۆش بووم، هەستم بە ئاسوودەیی و حەسانەوە دەکرد، بەڵام کە نزیکبوومەوە دیمەنێکی سەیر و سەمەرەم بینی، سەرم سوڕما، هەرگیز لە یادم ناچێ، بینیم گەنجێکی بەشان و شەوکەت، پیاوێکی پیری بەتەمەنی دابەستووە، بە قامچی لێی دەداو ئاوی پێ هەڵدەگۆزێ و بەدەوری بیرەکەدا هەڵی دەسوڕاند، زۆر بەزەییم بە کابرای پیردا دەهاتەوە.

برسێتی و تینوێتیم لە بیر نەما، پەلاماری دەستی کوڕە گەنجەکەمدا، بەبێ سەلام و کەلام قەمچیەکەم لێسەند و وتم: خوا بتگرێ ئەوە باوکتی کوشتووە؟ غەدر و خیانەتی لێکردوی؟ بۆچی وای لێدەکەی؟

وتی: باوکی نەکوشتووم، بەڵکو خۆی باوکمە و ڕقم لێی هەستاوە، ئاوای لێنەکەم دڵم ئاو ناخواتەوە.

کابرا پیرەش هەناسەیەکی ساردی هەڵکێشا و وتی: لێی گەڕێ، هەقی خۆیەتی و من موستەهەقم، منیش لەم شوێنەدا باوکی خۆم بەپیری ئاوا دابەست و ئاوم پێهەڵگۆزت، ئیتر کابرا قەناعەتی بە کوڕەکە کرد، ئەگەر تۆ واز نەهێنی و ئەم کارە خراپە بنبڕ و ڕیشەکێش نەکەی، لە تەمەنی پیریدا تۆش هەمان حاڵەت چاوەڕێت دەکات و زەلیل و گرفتاری دەستی کوڕەکانت دەبی، کوڕە گەنجەکەش پیاوانە بەگوێی کردم، ماڵی ئاوا بێت و ئەم شەڕە جاریەی ڕیشەکێش کرد.

نەبیٚ، ئەوە منداڵەکەیە لەلای پیرموحەممەدەوە دێتەوە، (پیرموحەممەد) ئەزرگەی پیاوچاکێکە سەد مەترێك لەولای ماڵی خۆمانەوە بوو، لە قەراغ ئاوایی.

منداڵەکەیان هێناو پشکنییان بزانن هیچی لێنەهاتووە، یەکێکیان دەیووت: جنۆکە بردوویەتی، یەکێکی دیکە دەیوت: بەدەم خەوەوە ڕۆیشتووە، یەکێکیتر دەیووت: باسی جنۆکە و منۆکە مەکەن با منداڵەکان نەترسن، دەستیان کرد بە پرسیار کردن لە منداڵەکە، بۆچی ڕۆیشتی؟ بۆ کویٚ ڕۆیشتی؟ نەترسای؟

منداڵەکەش هیچ نەشڵەژابوو، تێکنەچوو بوو، وتی: وەڵڵا چووم بۆ لای پیرموحەممەد.

- بۆچی چووی بەم شەوە، خوا بتگریٚ؟

+ چووم لێم پرسی: کەی باوکم دێتەوە؟

- ئەی چاوت بە پیرموحەممەد کەوت؟ چی وەڵام دایتەوە؟

+ بەڵیٚ هەر خۆی وتی: بەیانی باوکت دێتەوە، خەمت نەبیٚ!

دایکم وتی: قورم بەسەر ئەترسم منداڵەکەم شێت بوبیٚ، ئەم قسانە چیە دەیانکات؟

+ وەڵڵا پیرموحەممەد وتی: بەیانی باووکت دێتەوە، ئێستا برۆ بخەوە، خەمت نەبیٚ.

هەرچۆنیٚ بیٚ خەوتین و دایکیشم هەر دوعاو نزای دەکرد، بۆ منداڵ کە تێکنەچوبیٚ و شێت نەبوبیٚ، بۆ باوکیشم کە بە سەلامەتی بێتەوە.

بەیانی جەژن بە نائومێدیی سفرەمان ڕاخست، دایکم بە دەم فرمێسك ڕشتنەوە ئەو نان وچێشتەی بۆی لێنابووین هێنایە سەر سفرەکە و هەموومانی بانگ کرد و دەستی بەسەرماندا هێنا و ماچی کردین و وتی:

ـ یەڵڵا بسم الله بکەن و دەست بکەن بە نانخواردن، دەی ڕۆڵە خێراکەن، ئێستا میوانی جەژن دێن، بەڵام خۆی بۆی نەدەخورا، لەگەڵ قسەکەی دایکمدا تەقەی دەرگا هات، هەموو بە یەکجار سەیری دەرگای دەرەوەمان دەکرد، لەو کاتەدا باوکم خۆی کرد بە ژووردا، خۆشی و شادییەك دڵمانی فێنك کردەوە کە هەرگیز بۆمان دەرنابڕدریٚ و نازانین باسی بکەین، ئێستاش کە دەیگێڕمەوە فرمێسك دەزیەتە چاوەکانم، هەموومان بە یەکجار باوەشمان پێدا کرد، ئۆخەی ئەم جارەش لە هەتیووی نەجاتمان بوو.

وتمان چۆن بەرەڵا بووی؟ وتی: خۆیشم نازانم ئەم بەیانییە زوو ناویان خوێندمەوە، وتیان: تۆ هیچت لەسەر نییە و هیچت لەسەر نەماوە، پەنجە مۆریان پێکردم و خوا حافیزیان لێکردم خۆیشم بڕوام نەدەکرد.

## تەمەنی (١٤) ساڵ بوو، پێنج حەجی کردبوو!

**لە ساڵی (٢٠٠٧ ز) (١٤٢٨ کۆچی) چووم بۆ زیارەتی ماڵی خوا بۆ حەجکردن، بە ڕاستی سەفەرێکی مێژوویی و ئەرکێکی خوایی و پایەیەکی ئیسلامی پیرۆزمان ئەنجام دا، خوا لێمان وەرگرێ.**

**زۆر شتی سەیرو سەمەرەو گرنگ و سەرسوڕهێنەرمان بینی، ناکرێ هەموویان بگێڕینەوە، بەڵام ئەم نموونانەتان وەکو نۆبەرە بۆ دەگێڕمەوە:**

لە شاری مەککەی پیرۆز لە گەڕەکی (حي العوالي) بووینە میوانی ماڵێکی کورد بە ناوی مامۆستا کەمال، کە قوتابی ماستەر بوو، ماڵ و منداڵ و خێزانێکی زۆر ژیر و ڕۆشنبیر و بە ئەدەبی هەبوو، کوڕێکی هەبوو ناوی (شادی) بوو لە پۆلی یەکی ناوەندیی بوو، زۆر خزمەتی کردین، ئێمەش پرسیارمان لێکرد: دەربارەی ژیانی ئەوێیان و خوێندن و بەسەربردنی ژیانی ڕۆژانەیان لەوێ، وتمان کاکە شادی تەمەنت چەندە؟ وتی: (١٣ ساڵ)، وتمان: کاکە شادی چەندت قورئان لەبەرە؟ وتی: دوانزە جوزو، وتمان: چەند حەجت کردووە؟ وتی: بە ئەم ساڵەوە (٥) حەجم کردووە، واتە: بەم حەجەوە لەگەڵ ئێوە دەیکەم!

دوای گەڕانەوە چوومە سەردانی پیاوێکی ئاوارەی بەغدادی کە لە پیرەمەگروون بەناوی (ئەبوغەسسان) نیشتەجێ بوو، لەوە و پێشیش لێپرسراوی کاروانی حەج بوو، ئەو بەسەرهاتەم بۆ گێڕایەوە، وتی: منیش باش بوو بیرم هاتەوە شێخ یاسین کە لەسەردەمی حوکمڕانی حیزبی بەعسدا لە عێراق فەرمانی گرتن و ئیعدامکردنی دەرچوو بوو، بەڵام بە

یارمەتی خوا، کۆمەڵێ موسڵمان دەریانکرد بۆ سعودیە، ئەم ساڵ هەواڵیم زانی دوانزە کوڕ و کچی هەیە، هەموویان هەموو قورئانیان لەبەرە.

# لە بەندیخانە خاوەنی پارەکەم دۆزیەوە

**حاجی نامیق، دۆستی گیانی بەگیانی مامۆستا مەلا مەحمودی ئازادیی بەسەرهاتەکە بەسەر خۆی هاتووە و بۆ مامۆستای ئازادیی گێڕاوەتەوە، منیش لە دەمی مامۆستاوە نووسیومە:**

لە کۆڕەوەکەی ساڵی (١٩٩١)دا، واتە: ساڵی ڕاپەڕین، هەندێك کەس بە دزیەوە گەڕانەوە، هەندێکیش لە ئێران و تورکیا مانەوە، ئێمە یەکێك بووین لەو ماڵانەی گەڕاینەوە، ڕۆژێك لە نێوان سەیدسادق و عەربەت، گونییەیەك کەوتبوو، منیش هەڵم گرتەوە، کە زالکی گونییەکەم کردەوە بینیم پڕە لە پارە، هەمووی دە دیناری و پێنج دیناری بوو، بژاردم (١٢٥) هەزار دیناری سویسری بوو، بردمەوە ماڵەوە بە نهێنی، زۆریش دەترسام کوڕ و کچەکانم دەستکاری بکەن، بۆیە چاك حەشارمدا.

پاش دوو ڕۆژ چووم بۆ بەغد، لە نزیك خالس، لەسەر ڕێگای گشتیی نێوان کەرکوك ـ بەغداد، گیرام، دەستبەجێ بردیانم بۆ کەرکوك بۆ بەندیخانە (هەیئە)، لەوێ زۆر خەفەتم لە پارەکە دەخوارد دەترسام کوڕەکانم، یان خێزانم دەستکارییان بکەن، چونکە هەژاری بوو منیش بۆ دینارێك پەکم کەوتبوو، پیاوێکی کامڵی لێبوو زۆر سوعبەتی لەگەڵ دەکردم، پێیدەوتم: ئەوەندە خەفەت مەخۆ، بۆ دەترسیت؟ پیاو کە هاتە ژیانەوە هەر لێی دەقەومێ و بەرخی نێر بۆ سەربڕینە.

منیش بە قەدەر گونییە پارەکە خەم لەسەر دڵم بارگەی خستبوو، ئەوەی کە لە دڵیشمدا بوو نەدەکرا بۆ ئەوی باس بکەم، هەتا دوو، سێ ڕۆژ بەرگەم گرت و نهێنی خۆمم نەدرکاند،

ئەویش هەر بەردەوام دەیووت ترسی بۆ چیە، یان دەمانکوژن، یان بەرەلاّمان دەکەن، عەیبە تۆ ئەوەندە دەترسی.

پاشان کابرا خۆی پێنەگیرا و بە نیوە تورەییەوە وتی: ئەگەر تۆش وەك منت بەسەر بهاتایە چیت دەکرد؟ ئینجا دەستی کرد بە گێرانەوەی بەسەرهاتی خۆی، منیش لە ناچاری گوێم بۆ گرت، وتی: کاکە تۆ وەکو من بوویتایە چیت دەکرد، من یەك تاقە برام هەبوو، لەم ڕاکردن و کۆڕەوەدا براکەم جوانەمەرگ بوو، دوو هەتیوی لە پاش بەجێما کەمپایینێك (دەڕاسە)یەکی شەریکییان هەبوو بۆم فرۆشتن و بەشە پارەکەی خۆیان کە (١٢٥) هەزار دیناری سویسری بوو لە گونییەیەکدا، دامنابوو، لە کاتی ڕاکردنەکەدا لەڕێگادا لێمکەوتووە، من داخ و پەژارەی گرتنم نییە، خەم و خەفەتی پارەی ئەو منداڵە هەتیوانە لێم جیا نابێتەوە و بۆتە دێوەزمە لەسەر دڵم.

ئینجا منیش لێم پرسی ناونیشانی پارەکە چیە؟ وتی: جا هەر ناونیشانێکی هەبێت چی لێدەکەیت؟ ئەویش هەمووی بەڕاست و دروستی بۆ گێرامەوە و ئەو ناونیشانانەش بە بەرچاومدا گوزەریان دەکرد.

وتم: لەوە زیاتر خەفەت مەخۆ، إنشا ألله خوا بۆت دەدۆزێتەوە، خەفەتەکەی منیش بە قسەکانی ئەو کەمبوونەوە، بەلاّم قسەم نەکرد، وتم: بەس خۆزگە ئەوەندەم تەمەن هەبووایە تا پارەکەت دەدۆزیەوە بۆ دوو برازا هەتیوەکەت.

لە دڵی خۆمدا وتم: خوای گەورە بۆیە من و تۆی لەم بەندیخانەیە یەکخستووە هەتا پارەی ئەو هەتیوە بێ باوکانە نەفەوتێ، بۆ بەیانی ناوی من و کابرا خوێندرایەوە، گرتنی من و ئەو هیچ پەیوەندییان بە یەکەوە نەبوو، بەلاّم لە یەك ژووردا بەند بووین.

وتیان: تۆ هیچت لەسەر نییە بڕۆوە بۆ ماڵی خۆت، منیش بە گەیشتنی ماڵەوە پارەم قەرز کرد و ڕۆیشتم بۆ هەولێر بۆ ماڵی کابرا بەو ناونیشانەی لە بەندیخانەکەدا لە خۆیم وەرگرتبوو، پارەکەم بۆ بردنەوە و وتیان خەفەتی باوکمان لە پارەی هەتیوەکان ناخۆشترە، وتم: باوکیشتان لەگەڵ من بووە لە بەندیخانە.

هەردوو هەواڵە خۆشەکەم بۆ بردن، لە پارەکە پانزە هەزار دیناریان بە گەردن ئازادیی دامێ، منیش سوێندم خوارد و پێم چەقاند و وتم: یەك دینار وەرناگرم، لەبەر خوا ئەو کارەم کردووە..

لە کۆتاییدا دەڵێم ئەگەر دووچاری ئەو خەفەت و پەژارە و چەند ڕۆژ گرتنە نەبوومایە، لەوانەیە هەرگیز خاوەنی ئەو پارەیەم نەدۆزیایەوە.

## ئەو مامەڵەیەی بە بێ پرسی هاوسەرەکەی کردی سەری خوارد

بژێوی زۆر بە زەحمەت پەیدا دەکرا، کار و کاسبی نەبوو، سەرباری هەموو ئەوانەش، کرێ خانوو پشتی چەماندبووین، منداڵی ڕەشوڕووت بەردەوام داوای جل و بەرگ و پێڵاو و یاری و خواردنی خۆشیان دەکرد، داوایان دەکرد بیان بەین بۆ سەیران، ئیتر منداڵ لەبەر دەرگا و لە قوتابخانە باسی چیان بکردایە، ئەمانیش داوایان دەکرد و خۆیان لە خۆڵدا دەگەوزاند و دەکڕوزانەوە، ئێمەش هیچ دەسەڵاتمان نەبوو، هەژار و نەدار بووین، لە ترسی خاوەنماڵیش نەوەك لە خانووەکە دەرمانپەڕێنێ، هەرچیمان دەست دەکەوت دامان دەنا بۆ کرێی خانوو، هەرچی لەوەش زیاد بووایە خەرجیەکی ڕەشوڕووتانەمان پێ بەسەر دەبرد، بە سکێ تێر و بە سکێ برسی.

منداڵەکانمان، ئەوانەی قوتابی بوون، هەر بە جلە کۆنەکانی ساڵی ڕابردووەوە دەچوون بۆ قوتابخانە، بە زۆر ڕەوانەمان دەکردن بۆ قوتابخانە، دەگریان و دەیانووت: ڕوومان نایەت، هاوڕێکانمان جل و بەرگی تازە و جوانیان کڕیوە، گاڵتەمان پێ دەکەن، پێڵاوەکانمان چەند جار پینە کراون، پینەکان لە چەرمی پێڵاوەکان زیاترن.

لەگەڵ هاواری شت فرۆشەکاندا منداڵەکانمان بە ئومێدی پارە وەرگرتن ڕایان دەکردە ژوورەوە، بەڵام بە نائومێدیی و دەستی بەتاڵ و چاوی پڕفرمێسکەوە دەچوونەوە دەرەوە،

ڕۆژی چەندجار لە کۆڵان هاوار بکرایە (مریشکی قەڵەو)، ئەوەندە جار ماڵی ئێمە گریانی لێ بەرز دەبووەوە، بۆ مریشکمان بۆ ناکڕیت؟ جەرگم پێیان دەسوتا، بەڵام چارم نەبوو.
باوکی منداڵەکان بە قەرز و قۆڵە سەیارە کۆنەیەکی کڕی و وردەواڵە و پێداویستی ماڵانی پێدەفرۆشت، بە هەموو جۆرێك شتەکانی ساغ دەکردەوە، بە قازانجی کەم و زۆر، بە قیست و بە قەرز.

زۆرێك لە مەعمیلەکانی بە هەفتانە وبە مانگانە پارەکەیان بە بەش بەش ئەدایە، یەکێ لەو مەعمیلانە کە بە قیست شتی لێکڕیبوو، ژنی ئەفسەرێك بوو، جارێکیان ژنەکە داوای شتێکی لێکردبوو پیاوەکە پێی نەبوو بوو، بەڵێنی پێدابوو ئەگەر دەستی کەوت بە تەلەفۆن ئاگاداری بکاتەوە.
کە شتەکەی دەست کەوتبوو تەلەفۆنی بۆ ژنەکە کردبوو، کوڕی ژنەکە هەڵیگرتبوو، لەو کاتەشدا کاکی ئەفسەر لە ماڵەوە دەبێ. بە کوڕەکەی دەڵێ: ئەوە کێ بوو تەلەفۆنی بۆ دایکت کرد؟ ئەویش دەڵێ: (من نایناسم، دەڵێ مەعمیلی دایکتم ).
ئەفسەری خوانەناس، بەبێ لێکۆڵینەوە و بەدواداچوون ژنە بێتاوانەکەی خۆی دەکوژێ، کە چەند وەختە بە قەرز و بە قیست شتی بۆ ماڵەکەی کڕیوە و ماڵی بۆ ڕازاندۆتەوە، پاشان دەستبەجێ چەکدارەکانی دەنێرێ کابراش لە ماڵ دێننە دەرەوە ودەڵێن: چی لێ بکەین؟ ئەویش بە تەلەفۆن پێیان دەڵێت: بیکوژن و لەت و پەتی بکەن.
دوای چەند ڕۆژ گەڕان و لێکۆڵینەوەی کەسوکاری کابرا دەڵێن: ئەم خزمەی ئێمە چەکداری فڵان ئەفسەر بردوویانە، ئیتر ئاشکرا دەبێت کە هەردووکیانی بە بێ تاوان کوشتووە.
ئێستا ئەو ئەفسەرە و چەکدارەکانی لە بەندینخانەی کەرکووکن کە بەرواری (١٠/١١/٢٠٠٩)یە.

داوا لە خوشکان دەکەم بۆ هەموو ئیش وکارێکیان با هاوسەرەکانیان ئاگادار بکەنەوە، چونکە هاوبەشی ژیانیانن، هەتا لە کۆتایی دا پەنجەی پەشیمانی نەگەزن، ژن و مێرد هەتا زیاتر ئاوێتە و هۆگر و ئاوەنگرۆی یەکتر بن و پرس و ڕایان بە یەکتر بێت، لای یەکتر بەڕێزتر و بێ گیر وگرفتتر و بێ خەم و پەژارەترن و لای خواش پایەدارتر و سەربەرزتر و سەرفرازترن.

مامۆستایەکی جێی متمانە و زۆر ناسراوە، بەڵام لەبەر ئەوەی خۆی نایەوێت ناوی بنووسم، ئاماژەم بە ناوەکەی نەکردووە، بۆی گێڕامەوە:

لە گوندێکی نزیکی سلێمانی بوومە پێشنوێژ و وتارخوێن، ئافرەتێك زۆر چاك بوو لەگەڵمان، زۆر بە گەرمی هاتووچۆی دەکردین و ڕێزی زیاد لە پێویستی لێدەگرتین، زۆر خۆی لێمان نزیککردبوویەوە، خەڵکیش باشیان باسی ئەو ژنە نەدەکرد و خۆشییان لێنەدەهات، جارجار بە ناڕاستەوخۆ و لە ژێر لێوەوە ئاگاداریەکیان ئەدامێ، ڕۆژێکیان هاتمەوە خێزانم - کە فێر بوو بوو بۆ هەموو شتێك پرسی پێدەکردم.-، وتی: ئەو ئافرەتەی زۆر هاتووچۆمان دەکات و لەگەڵمان باشە داوای ئاڵتوون و بازنە و گوێبەرۆکەکەی لێکردووم، دەڵێ براکەم ژن دەگوازێتەوە، بەڵام وتی: بە مەرجێك لێتوەردەگرم سوێندم بۆ بخۆیت لای کەس - تەنانەت لای مامۆستاش - باسی نەکەیت، هەر بەینی خۆم و خۆت بێت، بەڵام نامەوێت بێ پرسی تۆ شتی وا بکەم، وتم: بیدەرێ قەیناکە، پێم ناخۆش نییە.

ئاڵتوونەکانی برد بۆ ماوەی هەفتەیەك، بوو بە دە ڕۆژ، بوو بە دووهەفتە نەیهێنایەوە، دوو سێ جار خێزانم ئاگاداری کردبوو وتبووی: شاییەکە دواخراوە، دواتر خۆم بە هاوسەرەکەی و چەند خزمێکی تریم ووت، لەو کاتەدا ڕۆژێك لە بازاڕ دەهاتمەوە، خێزانم زۆر هیلاك بوو، بێهۆش و ئیختیارِ لە جێگەدا کەوتبوو، وتم: چیە؟ وتی: ئەو ژنەی ئاڵتوونەکانی بردووە گۆشتی قیمەی بۆ ناردووین، کردم بە شفتە، تەنها لەتێك شفتەم خوارد خەریکە پێی بمرم، بۆم دەرکەوت دەرمانی تێکردووە، یەك قاپی گەورەش هێلکە شکاوی بۆ ناردوم دەڵێ زۆرمان هەیە، بیکەن بە هێلکەوڕۆن بۆ ئەم نیوەڕۆیە با کۆن نەبێت.

بەڵێ شکاتمان لێکرد، کە قیمە و هێلکە شکاوەکانیان فەحس کرد، خراپترین جۆری زەهری تێکرابوو، بۆ ئەوەی خێزانم بمرێت و ئاڵتوونەکانی سەرەونگوم بکات و کەسیش نەزانێت.

# خەسووی دەرمان خوارد کرد

# دوو کوڕەکەی پێی مردن!

ئەمەش بەسەرهاتێکی راستەقینەیە و لە دەڤەری سلێمانی روویداوە، بەڵام لەبەر نەکولاندنەوەی برینی ئەو بنەماڵەیە ناکرێ ناوی بنووسم:

خەسووی وەکو پەپوولە وابوو، خواپەرست و خواناس، هاوسەرەکەیشی لە کاتی داخوازیی و مارەکردندا دووبارە و چەندبارە و تەئکیدی لێکردبووەوە کە من لە دایکم جیا نابمەوە، قسە لەم سەرەوە خۆشە، دوایی بروبیانووم پێمەگرە، دایکم لە جێی دایکم و باوکمە، حەز دەکەم هەتا ماوم خزمەتی بکەم ولێی دوور نەکەومەوە، بە ڕاستی دایکم ئازار و ناسۆری زۆری چەشت هەتا منی گەورە کرد.

ئافرەتەش زمانێکی خستە کالا، بەردی دەکرد بە ئاو (خەسوو دایکی دوهەمە، ئەوەی خزمەتی خەسووی بکات خزمەتی دایکی خۆی کردووە، هیچ منەتی تیا نییە جا ئەگەر من ڕێزی دایکی تۆ نەگرم ڕێزی کێ دەگرم، یا خوا ئەگەر وەکو دایکی خۆم سەیری نەکەم خودا بمگرێ... هتد).

بەڵێ ڕۆژان هات و ڕۆیشتن، ماڵیان پێکەوە نابوو، بوون بە خاوەنی دوو کوڕی جوان، ئیتر ئافرەتەکە کەوتە پرتەو بۆڵە: بە ڕاستی ئافرەت کە پیر بوو بێ کەیف و بێ چیکڵدانە دەبێت، ئەترسم خودا غەزەبمان لێ بگرێت، دڵیمان بۆ ڕاناگیرێت، ئاوا چەند ساڵی بە سەر برد، بەڵام بارودۆخەکە بەم قسە نەرمانەوە نەوەستا.

دایە گەورە زۆر منداڵەکانی خۆش دەویست، دڵ ئاوێنەی دڵە، منداڵەکانیش بە هەمان شێوە نەنکیان خۆشدەویست، پێشبڕکێیان دەکرد بۆ نانخواردن لەگەڵ نەنکیان، هەر یەکێکیان لە گەڵ ئەودا نانی بخواردایە زۆر خۆی بە بەختەوەر دەزانی و سەیری ئەوانی تری دەکرد و

کەیف و منەتی دەکرد بە سەریاندا، منداڵەکان ئاوا دایەگەورەیان خۆش دەویست، دایەگەورەش بە هەمان شێوە هەزار جار سەر و گیانی خۆی دەکرد بە قوربانیان، بۆ پارویەك نان دەجار خولقی دەکردن ویە بێ ئەوان بە دڵیەوە نەدەنووسا، ماڵەکەش دەوڵەمەند بوون، ڕۆژان هاتن و چوون، دایکی منداڵەکان دڵی کرمێ بوو لە ئاستی خەسووی، خۆی تووڕە دەکرد، ناشکوری دەکرد لە حاڵی خۆی، (ژنی خەڵکی هەموو حەسانەوە و ماڵی خۆیان هەیە و سەربەخۆن، تەنها من ئەم پیرەژنە بووە بە مووی لووت و لێم نابێتەوە)، هاوسەرەکەیشی دڵخۆشی دەدایەوە و گلەیی لێدەکرد کە تۆ وەعدتدا و سوێندت خوارد کە ڕێزی دایکم بگری و خوامان کرد بە شاهید، ئەوەتا دەبینی من چەند ڕێز لە دایك و باوکی تۆ دەگرم، ئینجا من دایکم ئێزن بدەم دەبێ بڵێم دەرمکردووە، خوا غەزەبمان لێدەگرێت، کێ دەڵێ بەرەکەت و ڕزق و ڕۆزی ئێمە بە هۆی ئەو پیرەژنەوە نییە ! ئێمە خزمەتی ئەو پیرەژنە بکەین وەکو ئەرکی خۆمانە، بەڵکو منداڵەکانیشمان سەلامەت بن و تووشی گیروگرفت نەبن، ژنەکە کە هیچ قسەیەك نەدەچوو بە گوێیدا، پیاوەکەش گوێی بۆ نەدەگرت و هەر کاتی بەڕێدەکرد، بە نیوە شەڕ و بە نیوە ئاشتی.

لە پاش ماوەیەك ژنەکە کەوتە دانانی پیلانی تازە و شەیتانیش بەرنامەڕێژیی بۆ دەکرد، بە هەردووکیان پیلانیان دانا، ژنەکەش هەستا بە جێبەجێکردنی پیلانە شەیتانییەکە، بەم شێوەیە ماوەیەك خۆی بێدەنگ کرد، باسی دەرکردنی پیرەژنی نەدەکرد، پیاوەکەش پێی سەیر بوو، لە دڵی خۆی دا دەیووت: إنشاألله ژنەکەم دڵێ چاك بووە، لەو ماوەیەدا زۆر لەگەڵ ژنەکە چاك بوو، شتی جوانی بۆ دەکڕی، دەیبرد بۆ سەیران، زۆر زیاتر لە جاران ڕێزی دەگرت، منداڵەکان هەموو دڵخۆش بوون کە نەنکیان بەجێیاننەهێڵێت، ماڵ پڕ بوو لە کەیف و خۆشی و شادی، بەڵام ئاگری پیلانەکە لە ژێرەوە تاوی سەندبوو، تازە دووکەڵ و گڕ و تینی دەسەند.

ڕۆژێکیان کە پیاوەکە لە ئیش بوو، منداڵەکانیش لە ڕۆیشتن و هاتنەوەدا بوون بۆ قوتابخانە، ژنەکە خواردنیدا بە منداڵەکان و ڕەوانەی قوتابخانەی کردن، ئینجا خواردنی تایبەتی بۆ پیرەژنەکە هێنا و ووتی: ئامۆژن گیان فەرموو نان و چێشتەکەت بخۆ، لەو کاتەدا هەردوو کوڕە گەورەکەی لە قوتابخانە هاتنەوە و سەلامیان کرد و داپیرەش بە قوربان و بە

ساقەیان بوو، فەرمووی کردن، ژنەکەش مەشغول و سەرقاڵی ئیش و کار بوو، بیر و ئەندێشەیشی لای خەسووی نەبوو، ئاگادار نەبوو کە پیرەژنەکە لەبەر خاتری کوڕەکان، خواردنەکەی بۆ نەخوراوە، هەر ئەوەندەی خۆش بوو کوڕەکان سەر و پاروویان خوارد و دەستیان کرد بە هاوار هاوار و ڕشانەوە، ژان گرتنی، بوو بە مقۆ مقۆ و بگرە و بەردە و هات و هاوار، چی بوو؟ چی ڕوویداوە؟ دەر و دراوسێ دابارین بە سەریاندا، ژنەکەش لە شڵەژاوی خۆی پڕ بە دەمی هاواری دەکرد: خەتای خۆم بوو، من دەرمان و زەهرم بۆ خەسووم کردە خواردنەکە و کوڕەکانم خواردوویانە، قوڕی کوێ بە سەری خۆمدا بکەم؟! چۆن ماڵی خۆم وێران کرد!

بەڵێ کوڕەکان هەتا گەیەنرانە خەستەخانە گیانیان لە دەستدا و مردن و داپیرەش بە سەلامەتی دەرچوو، هەر هاواری دەکرد: چی بوو؟ تو خوا کوڕەکان بۆ وایان لێهات؟ هەتا ژنەکە وتی: ئامۆژن من خۆم ماڵی خۆم وێران کرد، زەهرم کردە چێشتەکەوە بۆ تۆ، بەڵام ئەوان خواردنەکەیان خوارد و مردن، تەواو بە خوا چاوم پێیان ناکەوێتەوە، لەم قسانەدا بوون، پیاوەش ئاگادار کرابوو، بە هەڵەداوان و هەناسەبڕکێ گەیشتە ماڵەوە، پەلاماری ژنەکەیدا وتی: چی ڕووی داوە؟ کێ کوڕەکانی کوشتوم؟ ژنەکە بە دەنگی بەرز هاواری کرد و قژی خۆی دارنی و پڕی هەردوو دەستی قژی لەسەری هەڵکەند و وتی: من کوشتوومن بە دەستی خۆم! بە خوا کەس نەبوو، خۆم بوم! زەهرم کردە چێشتەکەوە بۆ خەسووم، بەڵام کوڕەکان خواردیان و هەردووکیان مردن! پیاوەکەش سێ بە سێ ژنەکەی تەڵاقدا و بەو شێوەیە ژنە ماڵی کەیف خۆش و بەختەوەری لە خۆی و ئەوانیش تێکدا و وێرانی کرد و پرسە و ماتەمینی و ماڵوێرانی باڵی کێشا بەسەر ماڵی پڕ کەیف و سەفادا.

دەی تۆش خوا بناسە و چاکە بکە با چاکە بێتە ڕێت، خراپە مەکە با خراپە نەبێتە ئاگر بۆ خۆت و ماڵ و خێزانت.

# بەڕاستی پیلانی ژنان گەورەیە

ئەمەش بەسەرهاتێکی راستەقینەیە و لە دەڤەری سلێمانی روویداوە، بەڵام لەبەر نەکولاندنەوەی برینی ئەو بنەماڵەیە ناکرێ ناوی بنووسم:

کاتێ رۆیشتە خوازبێنی کچەکە، پێیوت: من تەنها خوشکێکم هەیە، عازەبە، هاکە ئەویش شووی کرد و رۆیشت بە لای ماڵ و مێردی خۆیەوە، ئیتر ماڵ، ماڵی خۆت دەبێت و کەس قسە لە قسەتدا ناکات، خوشکەکەیشم دەڵێی پەپوولەیە، دەمەوەر نییە، هار و هاج و بێ شەرم و حەیا نییە، تۆ وەکو خانمی گەورەی ماڵ و ئەویش وەکو بەردەستە، بەوپەڕی رێزەوە ئیشکەر و گوێڕایەڵ دەبێ لە خزمەتتدا، بەم شێوەیە رێککەوتن، خوازبێنی و گرێبەست و خەنەبەندان و شەکراوخواردنەوە و گواستنەوە بە ماوەیەکی کەم تەواو بوو، (من رازی و تۆ رازی، نایەوێ حاکم و قازی).

ماوەیەکی زۆر مانەوە، زۆر ژیانێکی خۆش و بەختەوەریان هەبوو، خوشکەکەی لەسەر ماڵ بوو، چۆنی وەسف کردبوو زۆر زیاتر و چاکتر بوو، حسابی ناغاژن و خوشکە گەورەی بۆ براژنی دەکرد، ئیش و کاری ناوماڵی بۆ دەکرد، براژنە خەریك بوو چێشت لێنانی لە بیر دەچووەوە، خواردن و خواردنەوە و جل شۆرین و میوان بەرێکردن، رووخۆش و بە شەرم و شکۆ، بە دین و رەوشت بەرز، لەسەرخۆ و دڵنەرم، ئەم براژنە تەنها جارێك تووڕە بوونی لێ نەدی، بەڵام شەیتان گەرای فیتنە و ئاژاوەی لە دڵ و دەروونی ئەم براژنە بەدفەرەیدا دانابوو، بڕوبیانووی بەم کچە بەستەزمانە دەگرت.

لێی تووڕە دەبوو، دەنگی بەسەردا بەرز دەکردەوە، لە لای براکەی شکاتی لێدەکرد، منداڵەکانی لێهان دەدا، رەخنەی لە ئیشەکانی دەگرت، لە لای خەڵکی بە خراپ باسی دەکرد، هەتا وای لێهات خەڵکی لە کچە کەوتنە شك و بەدگومانیی!

ئافرەتی سپڵە وبەدنمەك دوای چەند ساڵ خزمەت، خزمەتی خۆی، مێردی، منداڵی، ماڵی، میوانی لە جیاتی پاداشت، پیلانی بۆ دادەنێ وبە سوك سەیری دەکات، منداڵی لێهان دەدا و بە مێردەکەی بە لێدانی دەدا! کار بەمەوە نەوەستا، (ئادەمیزادی خراپ و یاخی لە خوا، لە

دڕنده، خراپتره)، له لای براکەی بوختانی بۆ کرد که پەیوەندی ناشەرعیی لەگەڵ پیاوێکدا هەیە و ئاوا و ئاوای بۆ هۆنییەوە.

ماوەیەك بەو جۆرە گوزەراندیان، کچە ژیانی لێتاڵ بوو، له ترسی خوا نەبوایە دەمێك بوو خۆی سوتاندبوو، هەرچەند خەو وژیانی لێ تێك چوو بوو، بەڵام چاری نەبوو، ئەم ئافرەتێکی بەستەزمان وشەرمن، براژنیشی بێ شەرم و شەیتان و لەبلەبان و جادووباز، به زمانی لووس کابرای هاوسەریشی وەکو ئەڵقە لەدەست کردبوو، درۆی لێ کردبوە ڕاستی بێگومان، پیاوەش له گێلی خۆی، ژنەکەی به بەڵقیسی یەمەن نەدەگۆڕییەوە، به بێ پرسی ئەو دەستی به ئاودا نەدەکرد و قسەکانی له لای ئەم پیاوە وەکو نەخشی بەرد وابوون، هەرچی بیوتایە کەم و زیادی نەبوو، خوشکەکەی له بیر کردبوو، ژنەکەش بۆ جێبەجێکردنی پیلانەکەی زۆر خۆی له هاوسەرەکەی دەبردە پێش و به قوربانی دەبوو، وەسفی دەکرد و به بەژن و باڵایدا هەڵیدەدا، قوربان قوربانی بۆ دەکرد، پیاو هەبێ لەم دونیایەدا هەر تۆی، پیاوی ناو پیاوان، ئەوەندەی فوو تێکردبوو، کابرا خۆی لێ ببوە شتێکی عەنتیکە.

ئینجا که زانی کابرا زۆر لێی ئەمین بووەتەوە و له قسەی دەرناچێ، دەستی کرد به جێبەجێکردنی پیلانە گڵاوە شەیتانییەکەی، چوو بۆ خەستەخانە بۆ لای نەخۆشی ژنانە، چونکه بێزووی دەکرد، چووە خەستەخانە، ناوی خۆی نووسی، به ناوی خوشکی هاوسەرەکەیەوە نووسی، ناردیان بۆ تاقیگە، تاقیکردنەوەیان بۆ کرد، پزیشکی پسپۆڕ پێیوت: تۆ سکپڕیت، ئەمیش ناوچەوانی گەشایەوە و خۆشحاڵیی دەربڕی، کاکی پزیشکی بێئاگاش وای زانی ئەم ژنە زۆر تامەزرۆی منداڵە و به دانستە ئەم فەحسەی کردووە، به پزیشکەی وت: زۆر زۆر سوپاس، خوا حافیز.

که هاتەوە ئەو وەرەقەیەی له تاقیگە پێیان دابوو، ئەنجامی تاقیکردنەوەکەی تیابوو، به دزیەوە خستیە ناو جانتای دشەکەیەوە (خوشکی مێردەکەی).

ئینجا مێردەکەی بانگ کرد و دەستی کرد به قژڕنینەوە و له خۆدان و سنگ کوتان و به دەنگی نزم پێیوت: (چەندم پێوتی منت به درۆزن دەزانی، بڕوات پێ نەکردم، هەتا ڕۆژمان بەم ڕۆژە گەیشت، ئینجا بزانم چۆن چارەسەری دەکەی).

پیاوەکه وتی: چی بووە؟ چی ڕوویداوە؟ ئافرەت پێم بڵێ، شێت بووم!

ژنەکە: ئەی خوایە خۆزگە مەرگی خۆم بدیبایە، ئەم ڕۆژە ڕەشەم نەدیایە.

پیاوەکە: ئاخر چی بووە، لێم مەشارەوە، تۆ شێت بووی؟

ژنەکە: خۆزگە شێت بوومایە، شێتی چی، مردنی خۆم بە ئاوات دەخوازم!

ئیتر پیاوەکە ئارامی لێبڕا و هەستا و تەواو گەیشتە تینی، بە تووڕەییەوە چووە سەر سەری ژنەکەی و پێی وت: ئێستا پێم دەڵێی، یان سێ بە سێ تەڵاقت بدەم؟

ژنەکە: "بە دەم گریانی درۆینە و فرمێسکی تیمساحانەوە" وتی: دانیشە من تەڵاق مەدە، چارەسەری پەندی خوشکە چاك و ڕەوشت بەرزەکەت بکە! بزانە چ پەند و حەیاچوونێکی بەسەر هێناوین. !

پیاوەکە: خوشکی من چی کردووە؟

ژنەکە: بەڵێ خوشکی جەنابت، ئەوە جانتاکەی سەیری کە بزانە ئەمڕۆ پزیشکی پسپۆڕ لە تاقیگە چ ئەنجامێکی فەحسەکەی داوەتێ!

یەکسەر لە جانتای کچە بەستەزمانەکەدا وەرەقەی فەحسەکەی دەرهێنا و پێی وت: بڕۆ نیشانی کەسێکی شارەزای بدە " ئەگەر ئێستاش بڕوا بە من ناکەی "، دادەم سکی پڕە، پیاوەکەش لە ترسی حەیاچوون و قسەی خەڵکی بە بێ سێ و دوو لێکۆڵینەوە، خوشکەکەی بانگ کرد و دەستی کرد بە لێدانی.

کچەکە: کاکە گیان چی بووە؟ بۆ لێم دەدەی؟ بە قوربانت بم، بە خوا هیچم نەکردووە.

پیاوەکە: هیچت نەکردووە؟ بزانم دەستت لەگەڵ کێ تێکەڵ کردووە؟ سکت لە کێ پڕە؟ ئەمڕۆ لە تاقیگە ئەنجامی فەحسەکەت چی دەرچووە؟

کچەکە: خەستەخانەی چی و فەحسی چی کاکە گیان؟ بە خوا لە ماڵ نەچوومەتە دەر، ئەوەتا دوو تەناف جلم شۆردووە، چێشتم لێناوە، فەحسی چی و شتی چی؟!، یەکسەر کابرا وەرەقەکەی بە سەر دەم و چاویا کێشا و بە چەقۆ تێی بەربوو، کوشتی.

ژنی کابراش هەر بەخۆی دا دەکێشا و هاواری دەکرد، هەتا دەرودراوسێ پێیان زانیی و بەسەریاندا دابارین، بە پەلە کچەکەیان گەیاندە خەستەخانە، بەڵام تازە کار لە کار ترازا بوو، کچی بێتاوان گیانی لە دەستدابوو، بێتاوان و لە ئاوی شەو پاکتر، بە مەزڵومیی سەری نایەوە.

کاتێك کابرا بانگ کرا و لێکۆلینەوەی لەگەڵ کرا، دانی نا بە تاوانەکەیدا: (ئەم خوشکەم خیانەتی شەرەفی لە ئێمە و هەموو بنەماڵەکەمان کردووە، ئەوە وەرەقەی فەحسەکەی، سکی پڕە و هێشتا شووی نەکردووە)، وەرەقەکەیان لێ وەرگرت و فەحسی تەرمی کچی بێتاوانیان کرد، کچەی بەستەزمان هەر کچە، نەسکی پڕە و نەهیچ نیشانەیەکی خیانەتی پێوەیە!.

لە کابرایان پرسی: چۆن ئەمەت بۆ دەرکەوت؟

وتی: ژنەکەم ئەمەی پێوتم، قابیلە ژنەکەم درۆم لەگەڵ بکات؟ چەند ساڵە لەگەڵمە، بە ئەندازەی دەنکە شقارتەیەك خیانەت و ناپاکیی لێنەکردووم، بەڵێ دوای لێکۆڵینەوە لەگەڵ ژنی کابرادا و فەحسکردنی، دەرکەوت ئەو فەحسە بێ کەم و زیاد فەحسی خۆیەتی!

دوای هەندێك هەڕەشە و لێدان، دانی نا بە تاوان و پیلانە گڵاوەکەیدا و لەبەردەم ئەفسەر و حاکم و هاوسەرەکەیدا چۆنییەتی پیلان و دانانی داوە شەیتانییەکەی ئاشکرا کرد و بە وردی بۆی گێڕانەوە، کە فەحسەکەی خۆی بە ناوی ئەوەوە کردووە و خستویەتیە جانتای کچەکەوە، هەتا تاوانباری بکا پێی و بە کوشتی بدات، پیاوەکەش هەناسەی سارد و پڕ لە ئاسۆری پەشیمانیی هەڵمژی و هەر لەوێدا لەبەردەم حاکم و ئەفسەری لێکۆڵەر، ژنەکەی سێ بە سێ تەڵاق دا و لێی جیا بوویەوە بۆ هەتا هەتایە و منداڵیش بێ دایك و باوك بوون، دایك تەڵاقدرا و باوکیش چووە بەندیخانە.

خودا دەفەرموێت: ﴿إِنَّ كَيْدَكُنَّ عَظِيمٌ﴾، بە ڕاستی ئەی ئافرەتان پیلانی ئێوە زۆر گەورە و ترسناکە.

# لەچاوتروکانێکدا

# ناوی خۆیشی لەبیرچوویەوە

کاتێك بەسەرهاتەکەیان بۆ گێڕامەوە زۆر بەلامەوە سەیر بوو، چونکە جەنابی مامۆستام (١) دەناسی و بە خزمەتی گەیشتبووم، بۆیە زۆر موشتاق و تامەزرۆی سەردانی بووم، لەگەڵ ئەوەشدا دەمویست بەسەرهاتەکە بەم شێوە سەرسوهێنەرە ڕاستەخۆ ببیستم و بشزانم سەرچاوەی بژێوی ژیانی ئەو کەڵەپیاوە خەباتگێڕە چیە؟ ئەو موجاهیدە ماندونەناسە چۆن ژیان بەسەر دەبات؟

بە ڕاستی ئەو پیاوێکی زۆر ئازا و زیرەك و کۆڵنەدەر بوو، هەوڵێکی زۆری دابوو لە دەستخستن و گەڕان بە شوێن زانستە شەرعیەکاندا، زۆر حەزی لە خزمەتکردنی قوڕئان بوو، زۆر عاشقی قوڕئان و لەبەرکردنی بوو، خودای گەورەش ئەو بەخششە گەورەیەی پێ بەخشیبوو، کە لە ماوەی ژیانی لاوێتیدا توانی هەموو قوڕئان لەبەر بکات و بە دەرسیش بە زۆر کەسی بڵێتەوە، زیاتر لە (٧٠٠) فەرموودەی سەحیحیشی بە سەنەد و مەتنەوە لەبەر کردبوو، ئەندازەیەکی باشیشی لە زانستە شەرعیەکان و زانستەکانی زمانی عەرەبی وەرگرتبوو، وەکو باقی زانایانی ڕاستەقینە و میراتگرانی بە ئەمەك ووەفاداری پێغەمبەری خوداش (درودی خوای لەسەر) حەزی لە ڕیزی پێشەوەی خەبات و جیهادی ئیسلامیی بوو، دەیووت: خودا ئێمەی کردۆتە پێشەوا (ئیمام)، کەواتە نابێ هەر لە نوێژدا لە پێشەوە بین، ئەگەر خەڵکی پێشەوایەتی ئایینمان پێ ڕەوا ببینن، پێشەوایەتی دونیا هەر قسەی لەسەر ناکرێت.

دوای چەند ساڵ فەقێیەتی و ئەم لادێ و ئەو لادێ و ئەم شار و شار بە هەژاریی و بە نەداریی و بە غەریبی و بە ڕەش و ڕووتی و هەناسە ساردی، بڕوانامەی زانستە شەرعییەکانی بە دەستهێنا و بوو بە پێشنوێژ و وتارخوێن.

(١)خۆم ئەم مامۆستا موجاهیدەم دەناسی (مامۆستا مەلا موحەممەد هۆرێنی) لە دەربەندیخان.

دواتر پەیوەندیی کرد بە کاری سیاسی ئیسلامییەوە و بوو بە بەردی بناغەی کاری ئیسلامیی و جیهاد و فیداکارسی لە باشووری کوردستان، دوای چەند خزمەت و خۆنەویستی گەڕایەوە بۆ دەریەندیخان، لە ماوەی چاوتروکانێکدا یەك تەزوو بە لاشەیدا هات، هەموو سی جوزئەی قورئان و هەرچی فەرمووده و زانستی شەرعی و زمانی عەرەبی و کوردی و نوێژ و ناوی ماڵ و خێزان و تەنانەت ناوی خۆیشی، لە بیر چوویەوە.!!

کە چووینە خزمەتی، فەرمووی: ناتانناسم، بە خوا هیچم لە بیر نەماوە، وا کچە بچووکەکەم تازە فێری (سبحان الله)م دەکات و ناوی خوام فێر دەکا، بۆ نوێژەکانیش کە پرسیاری لێکرا، فەرمووی: کوڕەکەم لە تەنیشتمەوە دادەنیشێ و وشە بە وشە پێم دەڵێ، کە وشەی دووهەمم پێدەڵێ، یەکەمم لە بیر نامێنێ.

سبحان الله... ﴿وَمَا كَانَ رَبُّكَ نَسِيًّا﴾. واتە: پەروەردگاری تۆ هیچی لە بیر ناچێتەوە و هیچی لە بیر ناچێ.

٢٠٠٨/٥/٤_٣

# لەبەر خوالێی خۆشبووم

زۆرجار دەمان بیست لە مامۆستای مزگەوت، لە پیاوە پیرەکان، لە چیرۆکخوانەکان، کە لێخۆشبوون سیفەتی خوایە، سیفەتی پێغەمبەران و پیاوچاکانە، سیفەتی باب و باپیران و پێشینانمانە، ئێمە ئەو هەموو ئامۆژگاریی و ڕەوشتە بەرزانەی باب و باپیرانمان کاری تێکردبووین، هەندێکی لە کردار و ڕەفتار و گوفتاری ڕۆژانەماندا ڕەنگی دابووەوە.

زۆرجاریش دەمانبیست لە ناو خزمان و کۆڕی بەر زۆپای مزگەوتدا باسی فلان پیاو ماقوڵ و فلان پیاو و سەرۆك هۆز و ڕدێن سپی، فلان بەرەباب دەکرا، کە چۆن خۆی کردۆتە پاڵەوان و بۆتە ئەستێرەی پرشنگدار و بەسەرهاتی بووەتە چیرۆکی دیوەخان و بەر سۆپای مزگەوت، ئێمەش گوێ لەسەر هەست بزانین، ئەم بە چی بووە بەم پیاوە.

دەمانبیست خەڵکی عەفوو کردووە و خوێنی خۆش کردووە، ئاشتەوایی کردووە و فیتنەی کوژاندۆتەوە، ئای خۆزگە منیش بۆم ڕێکەوتایە بە دوو وشە، یان بە هەڵوێستێکی مەردانە خۆم بکردایە بە پیاوی ناو پیاوان و پاڵەوانی چیرۆکی چیرۆکخوانان و وتەی کاریگەری وتارخوێنان.

بەیانی تاریك و ڕوونی هەستام لە خەو، خەریکی دەستنوێژگرتن بووم، لە دەرگا درا، نازانم دەستنوێژەکەم تەواو کرد، یان بە نیوەناچڵی وازم لێهێنا، ڕۆیشتم بەرەو دەرگا، پیاوێکی تەمەن سی چل ساڵە هەناسەی سواربوو، بەدەم هەناسەبڕکەوە وتی: کاکە سەلامون عەلەیکوم، منیش وەڵامم دایەوە، وتی: خێرت دەگات تەرمێکم پێیە، بەڵکو لەگەڵم ئەسپەردەی بکەی.

وتم: کوا؟ خێرا ڕایکرد بۆ لای سەیارەکەی و تەرمێکی لە بەتانییەکەوە پێچابوو، کە بەتانییەکەم لە ڕووی لادا تەماشام کرد خالیدی برام بوو، بانگی ئەحمەدی برام کرد وتم: وەرە ئەوە خالیدی برامە مردووە، لای دایکم و ئەوان باسی مەکە، ئەحمەد ڕای کرد، کابرا زۆر ترسا، وای دەزانی بۆ ئەو دەچێ، وتم: کاکە یەك تۆز مەترسە، ئەوە برای منە، بە خوا هەر ئێستا لێت خۆش دەبم، بەڵام تەرمەکەمان لەگەڵ داگرە و خوا حافیزت بێت، هەرچۆنێ بێ هەرسێکمان تەرمی خالیدمان داگرت، کابراش سواری سەیارەکەی بوو، گەڕایەوە، خواحافیزی کرد و چەند مەترێك ڕۆیشت.

ئەحمەدی برام هاواری کرد وتی: کاکە ئیسماعیل بە خوا خالید گیانی تیاماوە و زیندووە، بانگی کابرا بکە با نەڕوات لەگەڵمان ببات بۆ خەستەخانە، بانگی کابرام کرد، ئەویش ڕاوەستا، بەڵام زۆر ترسا وایزانی دەیکوژین، وتم: کاکی من مەترسە وخەمت نەبێ لەگەڵ پیاو لێت قەوماوە، بەڵام خالیدی برامان زیندوە و گیانی تیاماوە، لەگەڵمان بیگەنەرە نەخۆشخانە، کابرا حەمد و سەنای خودای کرد و خالیدمان خستە ناو ئۆتۆمبیلەکە و خێرا گەیاندمانە لای پزیشك.

دوای ئەمدیو و ئەودیو کردن و لێکۆڵینەوە، پزیشکەکە دەرزیەکی لێدا، زۆری پێنەچوو خالید چاوی هەڵهێنا و هێواش بوەوە، پاش ماوەیەکی کەم دەستی کرد بە قسەکردن، پزیشکەکە وتی: کەمێك تاساوە، ئەگەر نا زۆر بێتاقەت نییە و خەمتان نەبێت، خالیدمان

بردەوە ماڵەوە، هەمووی سەعاتێکی پێنەچوو، خالید هێواش بوویەوە و کابرا ڕۆیشت و ئیزنمان دا، ئینجا دایکم و خێزان پێیان زانی.

دوای ماوەیەك کابرای شۆفێر خۆی و چەند پیاوماقوڵێك خۆیان کرد بە ژووردا و توورەکە گونییەیەك پارەیان داناو وتیان: داوای لێخۆشبوون دەکەین، بەڕاستی کەمتەرخەم بووین و خەجاڵەتین و خەجاڵەتی دەکێشین، ئەم ماوەیە لە خزمەتتاندا نەبووین، بەڵام سەرقاڵ بووین، ماوەمان نەبوو زووتر بێینە خزمەتتان، ئەمە کوڕی ئێمەیە، لەم کوڕەی ئێوەی داوە بە سەیارە، جا ئەمرتان بە چیە لە خزمەتتانداین و سەرمان لە ڕێدایە و بچووکیتان دەکەین.

منیش قسەکەم لە دەم سەندەوە وتم: بە ڕاستی من هەر یەکەم سەعات لێی خۆش بووم و عەفووم کرد، ئەو کاتەی بە مردوویی هێنایە بەردەستم و تەرمەکەی بۆ داگرتم، من لەبەر خوا لێی خۆشبووم، نەك لەبەر گونییە پارەی ئێوە، خوا حافیزتان بێت، گونییە پارەکەتان بەرنەوە و دینارێکتان بە ئێمە حەرام بێت.

٢٠١٠/١/٣١

# ئاگاتان لە داوی شەیتان سیفەتەکان بێت

## ئاگادارییەك لە خوشکێکی مارانگازەوە

شەوی ١١-٢٠١٠/٦/١٢، خزمێکمان کە هاوڕێی ئەم کچەیە لە ماڵی خۆمان ئەم بەسەرهاتەی گێڕایەوە:

ژیانێکی زۆر خۆشمان هەبوو، پاشامان بە گەدا نەدەزانی، کەسوکاریش زۆر ئومێدیان پێم بوو، لە ڕەوشت و دین و ئاستی زانیارییم ڕازی بوون، کاتێك گەیشتمە زانکۆ زۆر کەیفم بە خۆم دەهات، کۆششی زۆر و نمرەی بەرز لە بەختم بوو، هاوڕێکانم ئاواتیان بە دەوڵەمەندیی

و جوانیی و نمرەکام دەخواست، دینداری و ئاکار و ڕەووشتی خۆم و دابونەریتی خانەوادەکەم پەرژینێکی پۆلایین بوون بۆ خۆپاراستنم و پارێزگارییم لە کاری هەرزەیی و ناشایستە، بەڵام لە قۆناغی کۆتایی زانکۆدا گەنجێکی زمان شیرینی لەسەرخۆ بووە ناسیاوم، زۆر بە هێمنیی و نەرمیی خۆی لێ نزیك دەکردمەوە، وام هەست دەکرد زۆر دڵسۆزمە، خەمرەوێنی پاشەڕۆژی منە، هەتا لەگەڵی بوەستامایە بە کەمم دەزانی، لە دەرسا حەزم دەکرد زوو تەواو بم و بچمە کەنارێکی باخچە، یان باڵەخانەی زانکۆ و لەگەڵ ئەو جوانخاسەی خودا بۆی ڕەخساندووم قسە بکەم، باسی ژیانی داهاتوو و ژیانی هاوسەرگیرییم بکەم لەگەڵیدا، ئەوەندە بە وتەی شیرین و بە قسەی ڕازاوە و قەشەنگ کاری تێکردبووم، هەنگوینی لە زارم و ڕۆنی لەبەری پێمدابوو، وام دەزانی لە دونیادا لەو گەنجە ڕاستگۆتر و بەڕێزتر و بەوەفاتر نییە، ئەگەر هەڵە و کەموکورتیشی هەبوایە لەبەر چاوم نەدەگرت، بەڵکو بە چاك و بە نیازپاکیی بۆم لێکدەدایەوە، لە دڵی خۆمدا شانازییم دەکرد کە دەستە خوشکەکانم نەیانزانیوە شوو بکەن.

زۆر پەلەم بوو بناغەی کارەکە ئاشکرا بکەم لە کەمترین ماوەدا کۆتایی پێبێت و بە ئاواتی خۆم بگەم، کارەکە وردە وردە بەرەوپێش چوو، قسەکە بە باوکم گەیشتەوە، کاتێك باوکم کوڕەکەی بینی و قسەی لەگەڵ کرد، پێیوتم: کچم بە قسەی باوکی خۆت بکە ئەم گەنجە لەسەرسەریی و شەللاتیی و هیچ بە خۆوە نەدیو دەچێت، شووی پێمەکە، لێم عەیانە دەتکاتە پەند ومەخسەرە و سووك و ڕیسوات دەکات.

لەگەڵ هەموو قسەیەکی باوکمدا وامدەزانی خەنجەری ژەهراویی بە جەرگمدا دەکات، بەڵام باوکم هەر لەسەر قسەی خۆی سوور بوو، کە دەیووت: هەژار و نەدارە، دەمووت: باوکە ئێستا قوتابییە، دواتر مەعاشی چاکی دەبێت، ئەو شەهادەی بەرزی هەیە، ئەو دەڵێ من خۆشترین ژیانت بۆ مسۆگەر دەکەم، ژیان هەر سەیارە و ماڵ نییە، ئێمە دەتوانین ژیانمان بکەینە باخی بەهەشت، بە جەماعەت نەبێ نوێژ ناکەین، نوێژی سوننەت و شەونوێژ دەکەین و فریشتەئاسا دەژین.

باوکم ئاخی هەڵدەکێشا، هەر دووبارەی دەکردەوە:

کچی شیرینم من باوکی تۆم، من لە هەموو کەس زیاتر دڵسۆزی تۆم، لە کەلی شەیتان وەرە خوارەوە، بە گوێی باوکی خۆت بکە، تۆ لە ماڵێکی دیندار و دەوڵەمەند و خاوەن بەڵێن و وەفا و بنەماڵەدا گەورە بووی، نە تۆ و نە ئێمە هاوڕێ و هاوشانی ئەمانە نین، ئەمە بە قەرەج و بێخانە و لانە دەچن، ئەمانە هیچ بە خۆوە نەدیوون، کچم واز بێنە، چی لە توانامدا بێت بۆت دەکەم.

کە باوکم تەواو بوو دەمووت: باوکە بەڵێنی پێداوم نوێژە فەرزەکان بە جەماعەت بکەین، بمبات بۆ حەج و عومرە، بە خوا لەو چاکترم دەست ناکەوێت٪ بەهەرحاڵ، باوکم ئیزنی دان، کوڕەکەش ڕۆژانە دەیان بەڵێنی تازە و گەورە و گرنگی پێدەدام و منیش وازم نەهێنا و هەر سوور بووم لەسەر هەڵخەتانی بێ بەرنامە و ساویلکانە و هەرزەبیرانەی خۆم، ناچار باوکم بە دڵشکاوی ونارەزاییەوە ووتی: با بێن، ماڵەکە هاتن، لە خۆشییدا خەریك بوو باڵ بگرم، کە دەستکرا بە قسەکردن، باوکم وتی: دەبێ وەکو کچەکەی ترمان (٤٥) مسقاڵ ئاڵتوونی بۆ بکەن، دەمراستەکەیان بە بێ منەتانە وتی: ئێمە لە (١٥) مسقاڵ ئاڵتوون زیاتری بۆ ناکەین، لایەنی ئێمەش بەبێ ویستی خۆیان ڕازی بوون، چونکە ئیختیارم لە دەست ئەواندا نەهێشتبووەوە، هەرچی ئەو ماڵە دەیانوت دەبوو ئەمان ڕازی بن، منیش هەستم بە بێدەسەلاتیی باوکم و خزمەکانم دەکرد، بەڵام بۆ گەیشتن بە مەرامی خۆم، گوێم لەو شتانە نەبوو.

مامەم (٤٥) مسقاڵ ئاڵتوونی بۆ کردم و پێشکەشی کردم، دوای گواستنەوەم باوکم لە ڕۆژی پۆیلانەکەمدا سەیارەیەکی بەرزی بۆ کڕیم و بۆی هێنام، نزیکەی (١٠) ملیۆن دیناریشم هەبوو، هەر (٤٥) مسقاڵەکە و (١٠) ملیۆنەکە و هەرچی هەمبوو زۆر بە بێ منەتی هەموویان خوارد و مەمنونیش نەبوون، بەڵکو وردە وردە بێڕێزیی نواندن و بەسووك سەیرکردنیان لێدەرکەوت، لە ماڵی خۆمان خزمەتکار و کارەکەر ئیشوکاریان بۆ دەکردین، لە ژیانمدا چێشتم لێنەنابوو، جل و قاپم نەشۆریبوو، تەنانەت ماڵیشم نەماڵیبو، بەڵام بە گەیشتنم بۆ ماڵی ئەو کوڕە ڕۆشنبیرە موسوڵمانە خواناسە چێشتی دە سەرخێزانیان پێ لێنام، قاپیان پێ دەشۆریم، ماڵیان پێ دەماڵیم، ئینجا یەك کەسیشیان ئەندازەی دەنکە نیسکێك مەمنوونم نەدەبوون و لێشم توڕە دەبوون و پلەی کارەکەریان پێبەخشیبووم، نەمدەوێرا یەك قسەش

بکەم، خەسووم دەیووت: ئەم هەموو کچە جوان و شۆخ و شەنگە مەمنون بوون، شوو بە کوڕی من بکەن، لە بەدبەختیمان ئەم قەلە ڕەشەمان بە نسیب بوو، یا خوا کەس بەدبەخت نەبێت.

هەتا دوای ماوەیەك بە هاوسەرە ڕۆشنبیرە خاوەن شەهادەکەم وت: من نان و چێشتی ئەم ڕەشەخێزانەم بۆ لێناندرێت، جا هەتا لە بیرم نەچوە با ئەوەش بڵێم: خۆیان دوو کچی گەنجیان هەبوو، مامۆستا بوون، یەك ئیشیان نەدەکرد، دەتگوت دەستیان بە خەنەوەیە، هەر ئەوەندەم خۆشی بوو قسەکەم لە دەم هاتە دەر، دەمی پڕا، زمانی درێژ کرد، دەتکەم بە قوربانی دایکم و باوکم، دەتکەم بە خزمەتکاری خێزان و کەسوکارم، باسیان نەکەیت، حەدت چیە بە خراپ باسیان بکەیت، بۆم هەستا بە شەق و لێدان، هەموو لەشی شین و مۆر کردمەوە و فرێی دامە ئەو دیو جامخانە، شەو لەوێ خەوتم، هەر قەبوڵم کرد و نەموێرا لە لای کەسوکارم بە تایبەتی باوکم قسە بکەم، بە ڕۆژ دەبوایە بە سەیارەوە لە خزمەتیاندا بوومایە، بۆ بازاڕ و بۆ خەستەخانە وپرسە و سەرەخۆشیی و ئاهەنگ و.. هتـــد.

کوڕەش ماستەری هێنا و بووە خاوەنی شەهادەیەکی بەرزتر، وتم: ئیتر چاك دەبێت، بەڵام سەد شوکر بە ڕابردوو، هەرگیز نەمبینیوە و نەمبیستووە خاوەن شەهادەی ئاوا ناڕۆشنبیر و دەمتڕن و جنێو فرۆش و زمان پیس، قسەی خۆشی جنێو بوو بە خۆم و باوك و دایك و کەسوکارم، هەتا جارێکیان بە سەردان ڕۆیشتمەوە تەلەفۆنی کرد بۆ نایەیتەوە، وتم: نایەمەوە، ئیتر هات بە دوامدا و باوکم هەستی بە شتێك کرد، بەڵام بە زمانی لووس نەزەری باوکیشمی گۆڕی و باوکم ڕەوانەی کردمەوە و وتی: هەموو کەس گیر وگرفتی دەبێت، ئێوەش سەرەتاتانە، بیر بکەنەوە و حەیای خۆتان و منیش مەبەن.

ئیتر لەو ڕۆژە بە دواوە لێم بوو بە ئاگری قورەت، بە دوو مانگ لێم نزیك نەدەبووەوە، قسەی خۆش و جوانەکانی جنێو و لێتووڕە بوون بوو، سوکایەتیی بە خۆم و کەسوکارم، ئەگەر ئەوەندە سەنگین و خانەوادە بوویتایە، بە دوو قسە شووت پێنەدەکردم، زوو زوو دەیووت: هەموو کچی زانکۆ حەزم لێدەکەن، هەر کەسیان داوا بکەم مەمنونیشم دەبێ، کچی وا جوان و شۆخ و شەنگ هەیە هەزاری وەکو تۆ دێنێت، دەستیشم ماچ دەکات، بیخوازم.

جارجار بیرم دەخستەوە ئەی کوا قسە شیرین و خۆشەکانت، کوا بەڵێنی ماڵە بەهەشت ئاساکەت، خێرا بە دوو سێ جنێوی ناشیرین دەمکوتی دەکردم.

چەند مانگێکی تریشم بەو حاڵە بەسەربرد، دەتگوت لە دۆزەخدام، هەتا شەوێك بۆم هەستا بە بێ هۆ ئەوەندەی لێدام بێکەس کوژی کردم، هەرچی گیانێك خوا بە منی داوە، شین و مۆری کردەوە و وەکو عادەتی خۆی فڕێی دامە ئەو دیو جامخانەکە و بۆ خۆی بێخەم لێی خەوت، منیش ئەو شەوەم بە ساڵێك لێڕۆیشت، ناچار بەیانی هەندێ ئاڵتوونم مابوو، پێچامەوە و ڕۆیشتمەوە بۆ ماڵی باوکم، زاویەکمان لەوێ بوو، سویچەکەم دایە و وتم: سەیارەکەم بۆ بفرۆشە، بە هۆی سەیارەکەوە زۆرجار کێشەمان بۆ دروست دەبێت، لە کاتی وەرگرتنی سویچەکەدا دەست و مەچەکی بینیم شین بۆتەوە، پێی زانی وتی: ئەوە لێی داوی؟ منیش بۆم نەشارایەوە وتم: ئەرێ وەڵڵا، زاواکەشمان وتی: ڕۆڵە خۆ تۆ بێ کەس نیت، با هەڵەیەکیشت کردبێت، باوك و کەس چۆن وازت لێدێنن.

شتەکە وردە وردە ئاشکرا بوو، بەڵام داوام لە زاواکەمان کرد باسی نەکات و سەیارەکەشم بۆ بفرۆشێت، منیش بە دڵشکاوی و مەینەتباری ملی ڕێم گرت بۆ ناو ئەو ماڵە خۆش و مێرد و خەسوو خەزوورە چاکەخوازەم!.

زاواکەشمان چوو بوو بۆ دوکانی هاوسەرەکەم، بە نیازی ئەوەی هەندێك ئامۆژگاریی بکات، (تۆ ڕۆشنبیری و ئەو مامۆستایە، چۆن دەبێ لێی بدەی، ئەگەر لێشی بدەی کەی ئەوە لێدانی ئادەمیزادە...)، بە خوا هاوسەری نامویارەکم زمانی لێی دەپڕژێ، ئەوەی خوا پێی ناخۆشە و هەرگیز نەوتراوە بە جنێو و قسەی نابەجێ پێیدا دێ، ئینجا دەڵێ: لێدان بۆ کەرە، مادام گێڕاویەتەوە دەبێ ئەوەندەی تری لێبدەم!!

من لەم کەین و بەینە بێئاگام، هەر بە گەیشتنی ماڵەوەم زاواکەمان تەلەفۆنی کرد وتی: ئێستا دێم بۆ لات لە کوێی؟ وتم: وا ئێستا گەیشتمە ماڵەوە، دوای کەمێك هات سەلامی کرد، دەستی کرد بە ئامۆژگاریی خەسووم، بە خوا خەسووشم دەمی بەرەڵڵا بوو، ئەوەی ناشێ بە منیش و بەویشی کرد، ئیتر زاواکەمان وتی: بە خوا ئێستە لەگەڵ خۆم دەتبەمەوە، خۆ لە خوێنا نەدراوی، پێش خۆی دام خوا خێری بنووسێ.

ئەوە ماوەیەکی زۆرە لە مەحکەمەداین، براکەشمی بە گرت داوە لە کاتی تاقیکردنەوەی سەری ساڵدا کە قوتابی زانکۆیە، وتویەتی: تەهدیدی کردووم، ئێستا کۆتا داوای ئەوەیە دەبێ دەست لە مارەییەکەم هەڵگرم، منیش لەبەرانبەر ئەو هەموو جادوو و چاوبەست و ستەم و لێدان و سوکایەتییەی ئەو هەر ئەوەم لە دەست دێ و دەڵێم: هەر عەفووی ناکەم، هەرچەند پێویستیشم پێی نییە.

ئێستا زۆرێك لە هاورێ کچەکانم شوویان نەکردووە، منیش بێوەژن و دڵشکاو و غەمبار و خەفەتبار و بێزراو گەڕامەوە لای ئەو باوك و دایکەی بە گوێم نەکردن و حیسابم بۆ نەکردن، هەتیوە بەرەڵڵای ناکەس بەچە بە شەهادەکەی و درۆ و فیشاڵ، خەریکە کچێکی تری لە من داماوتر لە خشتە دەبات.

لە کۆتاییدا من لە دڵسۆزییەوە بەسەرهاتی خۆم بۆ گێڕانەوە، هەتا ئێوەش بە ئاگری فڕوفیشاڵ و درۆ و جادووی ئەو شەیتان سیفەت و گورگانەدا نەچزێن کە لە پێستی مەڕدا خۆیان حەشار داوە.

## بەهاواری دایکییەوە گیانی دەرچوو

**دایکی نووسەری ئەم بابەتە ناوی (ئامینە مەحمود)ە و ئێستا لە ژیاندایە، دەگێڕێتەوە:**

کە لە کۆتایی ساڵەکانی سییەکاندا کە ئەو کاتە ژنبەژن باوی بوو، گرانیش بوو، زۆربەی خەڵکیش هەژار و نەدار بوون، هەرکات بێوەژنێك بدرایەوە بە شوو، یان ژنبەژنی پێبکرایە، مەرجی ئەوەیان دادەنا نابێ منداڵەکەی لەگەڵ خۆی بێنێت، لەبەر هەژاریی و نەبوونیی.

لەو کاتەدا لە گوندی کوڕەداوێ (بەری بچووك) ئافرەتێکی بێوەژن بە شوودرا و بەڵێنیان لێوەرگرتبوو کە منداڵە ساواکەی لەگەڵ خۆی نەهێنێت، کاتێك کاتی گواستنەوەی هات و ماڵی زاوا هاتن بە دوای بووکدا، منداڵەکە هەستی پێکردبوو، وەك دەڵێن لە دڵی گەڕابوو، هەر کە بەیانی بووکیان ڕازاندەوە، منداڵەکە کە تەمەنی ساڵ و شتێك بوو، لەگەڵ بینینی

دایکی بەو حاڵەوە غوربەتی هەستا و دڵی پڕ بوو، فرمێسکی دادەڕشت، زۆر دەگریا، گەڕەکی وەڕز کرد، بۆ ژیربوونەوەی و خەڵەتاندنی بنەگۆزەیەکی شکاو لەسەر بانیژەکە دانرا بوو، ئاویان بۆ مریشك تێکردبوو، یەکێکیان کە لەوانی تر زیاتر زگی پێی سووتا و بەزەیی بۆ جۆشا، منداڵەکەی بردە سەر سواڵەتەکە و ئاڕاستەی کرد و فێری کرد، سەیری ئاوی ناو سواڵەتەکە بکات و پێیوت: ئەوە دایەیە، ئیتر ئەو منداڵە بەستەزمانە وێنەی خۆی تێدا بینی، هەتا خەوی لێدەکەوت، بە شەو و بە ڕۆژ دەهاتە سەر ئەو سواڵەتە، سەیری خۆی دەکرد، وای دەزانی دایکیەتی، سەدان جار و بگرە هەزاران چارەسەری شۆڕ دەکردەوە بەسەر سواڵەتەکەدا و دەیووت: (دایە، دایە، دایە، دایە....)، شەو لە ژوورەوە بە هەڵەداوان دەهاتە سەر سواڵەتەکە و دەستی دەکردەوە بە وتنی: دایە.. دایە.

بەو حاڵەوە مایەوە هەتا دوای مانگێك بە دەم دایە دایەوە نەخۆش کەوت و بەو هەموو غەم و پەژارە و دەریایەك خەفەت و دڵتەنگییەوە سەری نایەوە و هەتا ئێستاش کە دەیگێڕنەوە جێگەی ئاسۆر و غەم و پەژارەیە.

ئەگەر لە یادیشم نەچووبێت منداڵەکە ناوی (گوڵچین) بوو.

هەر لەم ساڵانەی ڕابردوودا، ساڵی (٢٠٠٩) لە تەلەفیزۆنی زاگرۆس لەبەرنامەی (زومین) پیاوێکی پیشاندا کە بە فیتی ژنەکەی، کە باوەژنی منداڵەکانی بوو، دوای تەڵاقدانی ژنەکەی خۆی، ئەوی خواستبوو، هەموو ڕۆژێ جارێك و چەند جارێك لە منداڵە پێنج ساڵانەکەی خۆی دابوو، بە پەنجەرەوە بەستبوویەوە، بە دار و سۆندە و شەق و زللە لێی دابوو، چونکە باوەژنەکەی ڕۆژانە شکاتی لێکردبوو، ڕۆژی چەند جارێك بە لێدانی دابوو، کە گوایە بە گوێی ناکات، خۆی جنێو و درۆی هەڵبەستبوو کە ئاوا و ئاوام پێدەڵێت، منداڵەکە لەو ماڵ و خانە و لانەیە زیاتری شك نەبرد بوو، بۆیە هەر کە باوکی دەهاتەوە ئەویش دەهاتەوە ژوورەوە بۆ بەردەستی باوەژن و باوکی، باوەپیارە ئاسایی، بێبەزەیی، هەتا لە ئەنجامدا منداڵەکەیان خستە گیانەڵڵا، ئینجا باوەژنی دڵڕەق دەست و قاچی کردەوە، ئەویش بە ئیشارەتی لێوە وشك و ژاکاوەکانی داوای ئاوی کرد، بەڵام لەسەر قسەی خوشك و براکانی منداڵەکە، باوەژنی لە جیاتی ئاو، بە چنگ و پەنجە گورگ ئاساکانی دەم و لوتی منداڵی بێدەسەڵاتی هەڵلوشی، تا لە ژێر دەستیدا بە تینوێتی و بە دەستی ستەمی باوەژن و باوکی بێبەزەیی، وەکو

پەروانەی ناو ئاگر هەڵپڕوکا، ئەم مردنەش داخی کردە دڵی بیسەر و بینەرانەوە لە هەموو شوێنێکی ئەم جیهانەدا.

ئاخر منداڵ لە کاتی هەستکردن بە ترس و هەڕەشە پەنا بۆ باوکی دەبات، بەڵام ئەم منداڵە لە کاتی هەستکردن بە ئەوپەڕی ترس و لەرز لە ماڵەوە هەر گەڕایەوە باوەشی باوکی بێبەزەیی و دڵڕەقی، ئەویش وەکو دوژمنی باوەکوشتەی خۆی گرتبێ، بە لێدان بەربووە گیان و لاشەی ناسك و بێتاوانیی کوڕەکەی خۆی، لەگەڵ هەر لێدان و ئەشکەنجەدانێکیشدا هاواری باوکی دەکرد، تو خوا باوکە گیان بۆ وام لێدەکەی؟ هەتا زمانی جوڵا و دڵی لە لێدان کەوت...!!

# بۆنی دایکی کرد و گیانی دەرچوو

لە ڕۆژی ٢٠١٠/١١/١١ لەگەڵ دەستەیەك لە مامۆستایانی بەڕێز و پایەدار چووین بۆ دەڤەری (سۆران) و (سیدەکان)، بۆ سەردانی چەند قوتابخانەیەکی شەرعیی لە ناحیەی (سیدەکان)، زۆر دڵخۆش بووین، ئەوانیش بە هەمان شێوە، دوای بینین و دابینکردنی پێویستیی مامۆستا بەڕێز و فەقێ دڵپاکەکان، ئیتر شەوی هەینی بوو، بۆ خەوتنیش گەڕاینەوە قەزای سۆران، بەیانی کە هەستاین بۆ نوێژ، مامۆستا ئەبوبەکری سدیقی فەرمووی: مامۆستاینە ئەمشەو لە خەومدا پێغەمبەری خوا (سەلات و سەلامی خوای لەسەر بێت) هاتبوو بۆ ئێرە و بەم خانووەدا دەگەڕا، ئیتر هێندەی تر دڵمان بە کارەکەمان خۆش بوو.

بۆ نوێژی ئێوارە چووین بۆ گوندی (کانی بی)، بۆ سەردانی خزمەکانی مامۆستا ئەبوبەکر بە بۆنەی مردنی ئافرەتێکەوە، دوای نانخواردنی ئێوارە چووین بۆ ماڵی مامۆستای مزگەوت - مامۆستا خەیروڵلا -، لەوێ مەجلیسی قسە و بەسەرهات گێڕانەوە گەرم بوو، مامۆستا خەیروڵلا وتی: لای ئێمەش ڕووداوێکی زۆر خەفەتاوی ڕوویداوە، ژن و مێردێك بەینیان تێکچووبوو، ژنەکە ڕۆیشتبووەوە بۆ ماڵی باوکی، منداڵەکەشی جێهێشتبوو کە تەمەنی چوار مانگ دەبوو، منداڵەکە ئەو ماوەیە زۆر گریا بوو بۆ دایکی، بە شێوەیەك لە دەست گریانی

وەڕز بووبوون، خەڵکێکی زۆریشیان ناردبوو بە دوای ئافرەتەکەدا ـ دایکی منداڵەکە ـ، بەڵام کەسوکارەکەی نەیانهێشتبوو بێتەوە، بەڵێ دوای سێ مانگ، بە تکا و ڕجای زۆر ئافرەتەکە و خزمەکانی دڵیان نەرم بوو، ڕازی بوون ئافرەتەکە بگەڕێتەوە بۆ لای هاوسەرەکەی، ئافرەتەکەیان لەگەڵ خۆیان هێنایەوە، هەر کە گەیشتە دەرگایماڵەوە و گوێی لە گریانی منداڵەکەی بوو، هاواری کرد و وەکو شێت و هار ڕای کرد و باوەشی بە منداڵەکەیدا کرد و گوشی بە سنگیەوە و دەستی کرد بە ماچکردنی، منداڵەکەش بە بەرچاوی هەموانەوە لوتی نا بە سنگی دایکیەوە، بە یەك هەناسەی قوڵ بۆنی بە دایکیەوە کرد، هەناسە و بۆنی دایکی هەڵمژی و یەکسەر گیانی دەرچوو، کە ڕایانوەشاند گیانی تێدا نەما بوو.

با دایکان و باوکان لە ئاژاوە و کێشەی نێوانیاندا ئاکام وئەنجامی ئەو کێشە و لێکدابڕانە بێننە بەرچاوی خۆیان، خەنجەری ژەهراوی نەکەن بە دڵی ناسك و بێگوناهی منداڵە بێتاوانەکانیاندا.

# خوانادری

**ئەم بەسەرهاتە کەسێکی جێ متمانە بۆی گێڕامەوە:**

خێزانەکەی نەخۆش بوو بردی بۆ بەغدا، هەتا لە عەیادەکە هاتە دەر سەیارەکەیان دزرا بوو، کاتەکەش کاتی تەقینەوە و فڕاندن بوو، بۆیە خێرا سەیارەیەکی سەریەخۆیان گرت و بە خێرایی گەڕانەوە، لە ڕێگە لە دووزخورماتوو لایاندا بوو تا نان بخۆن، پێش ئەوەی بچنە ناو چێشتخانەکە تەماشا دەکات سەیارەکەی ڕاگیراوە و ئەمیش سویچی زیادەی پێ دەبێ، خێرا دایکی و خێزانەکە نەخۆشەکەی سوار دەکات و پێی پیادەنێت بۆ هەولێر، کە دەچێتە ماڵەوە تەماشا دەکات یەك دەفتەر دۆلاریش لەناو سەیارەکەیدایە.

## کوڕێکی گەنج و دڵخۆشکردنی دایک و باوک

ئەم ڕووداوەش برای ئەو کەسە بۆی گێڕامەوە کە براکەی تووشی نەخۆشی سەرەتانی خوێن بووە، زوو زوو دەمارە خوێنهێنەر و خوێنبەرەکانی دەتەقین، براکەی بردی بۆ تاران، لەوێ پزیشك ئیزنیدا، ووتی: چارەسەری لەسەر ئەرز نییە، بیبەنەوە خزمەتی بکەن هەتا دەمرێت، لە ڕێگە بە برا گەورەکەی وت: کاکە توو ئەو خوایە بە باوکم مەڵێ، ئەزانم دکتۆر چی وت: بەس بە باوکم مەڵێ با خەفەتم لێ نەخوات، هەتا دەمرم، با من بمرم، بەڵام باوکم خەفەت نەخوات، کە گەیشتەوە ماڵەوە دەستی کرد بە قسەی خۆش و گفتوگۆ و باسی سەفەر و دکتۆر و ئەم بابەتانە.

لە پاش ماوەیەك خۆی دەگۆڕێت و دەڕوات بۆ یاری دووگۆڵی بۆ ئەوەی باوکی بڕوا بکات بە قسەکانیان و دڵیان خۆش بێت، لەو کاتەوە کە گەڕایەوە لە یاری هەستی بە لەش سووکیی کرد و بۆریە خوێنەکان لەوە دوا یەك جاری تر نەتەقین، ئێستا زۆر چاکە وخۆی لە ناو خەڵکدا دەیگێڕێتەوە.

## خێرەومەندێکی تازەپێگەیشتوو

مامۆستا شێخ فاتیح داراغایی لە شەوی ٢١-٢٠/١١/٢٠٠٦ لە مەجلیسێکدا گێڕایەوە: کە لە بەندیخانەدا کوڕێکی لاوی تازەپێگەیشتووی لەگەڵ بووە، لە ساڵی (١٩٩٥) کوڕەکە بۆی گێڕاوەتەوە وتویەتی: ئۆتۆمبێلم هەبوو، سەردانی مەرزم دەکردو لەوێ کاسبیم دەکرد، هەتا جارێکیان لە گەڕانەوەمدا لە قەراغ شاری سلێمانی، کابرایەکی پیری پەککەوتە دەستی لێ ڕاگرتم، منیش وەستام و سوارم کرد و وتم: بۆ کوێ دەچی؟ وتی: بۆ فلان شوێن، وتم: ئیشت

چیه؟ کابرا جوابی بۆ نەدرایەوە و دەستی کردە گریان و بەدەم گریان و هەنسکەوە وتی: خێزانێکی زۆرم بەسەرا کەوتووە، لە بەیانی زووەوە ڕۆیشتوم یەك دینارم دەست نەکەوتووە، نازانم چۆن بچمەوە بۆ ناو ئەومالْ و منداڵە ڕەش و ڕووت و برسییە، کوڕەکە وتی: منیش یەکسەر ئوتومبێلەکەم لێخوڕی بۆ ژێر پردەکەی خوار مزگەوتی گەورە، لەویْ بە کابرام وت: تۆ دامەبەزە من هەندیْ ئیشم هەیە ئێستا دێمەوە و دەتگەیەنمە ماڵەوە، وتی: باشە، کابرا بە دڵی تەنگەوە و بە کۆڵیْ خەم و پەژارەوە دەستی بەر ناوچەوانی دا، منیش خێرا یەك فەردە ئارد و یەك فەردە برنج و یەك فەردە شەکر و یەك تەنەکە ڕۆن و هەندێك شتی وردەم بۆ کڕین و سواری ئوتومبێلەکەم بوومەوە، کابراش نەیزانی چیم کردووە و مەبەستم چییە؟! وتم: فەرموو خاڵە ڕێگەی ماڵەوەم پیْ بڵیْ، ڕۆیشتین بۆ ماڵیان، پیرەی داماو دابەزی و لە دەرگای دا، منیش دەستم کرد بە داگرتنی شتەکان و کابراش دەستی کرد بە دوعای خێر و هەردوو لەپی بەرز کردەوە بۆ ئاسمان و هەناسەی ساردی هەڵئەکێشا، زۆر پاڕایەوە و لاڵایەوە و سوپاسی خوای کرد، پاشان منداڵەکانی گشتیان هاتن بە گەورە و بچووکەوە کە زانیان شتم بۆ هێناون دەستیان کرد بە ماچکردنی سەیارەکەم، تەنانەت تایەی سەیارەکەشیان ماچ کرد، ئیتر منیش بە خوام سپاردن، هەرچەند داوای ناونیشانیان لێکردم، وتم پێویست ناکا، ماڵی من نییە، ماڵی خوایە.

کوڕەکە وتی: ماوەیەکی کەم دوای ئەوە مامەڵەیەکم کرد پەنجا هەزار دیناری سویسری قازانجم کرد، کە خۆم هەرگیز بە تەمای ئەو قازانجە زۆرە نەبووم و بەخەیاڵیشم دا نەدەهات.

# یارمەتی منداڵ

کاك موحسین ئەمینی لە ئێران لە شاری (...) کاری دەکرد، حەرەس موەلیدە بوو، مانگی بە (٢٠) هەزار تمەن، دوای تەواوبوونی ماوەکەی دەڵێ: وتم بۆم زیاد نەکەن ئەو کارە ناکەم، چونکە بەشم ناکات، وتیان زیادی ناکەن، دەوروبەرەکەش هەموو دەوڵەمەند و خاوەن ڤێلا بوون، لەو ماوەیە زۆر خەفەتی بێکارییم هەبوو، حەزیشم لێنەبوو ئەو کارە بکەم، کاری دیکەشم دەست نەدەکەوت، ڕۆژێکیان چووم سەموون بکڕم، لە ڕێگە ژن و منداڵێکم بینی چاوی بە سەمونەکە کەوت دەستی کرد بە گریان، ژنەکەش پەلی منداڵەکەی گرتبوو هەر ڕای دەکێشا، بە دزی دایکییەوە لەتێك سەمونم دا بە منداڵەکە و نەبوونیی و برسێتیی منداڵەکانی خۆمم هاتەوە پێش چاو، وتم: خوایە من بەزەییم بەم منداڵەدا دێت و ڕازی نیم برسی بێ، ئەرێ خوایە تۆ ڕازی دەبی منداڵی من برسی بن؟، میوانمان هات وتیان: دەچینە تاران، ئێوارە دەگەڕێینەوە، منیش وتم: من بۆم ناکرێت، دەگەڕێم، بەڵکو کارێکم دەست کەوێت، وتیان: بۆ بێکاریت؟ وتم: بەڵێ، وتیان: هەوڵێکت بۆ ئەدەین.

کە ئێوارە هاتنەوە وتیان: کارێکی باشمان بۆ دۆزیەوە، کابرا دەگەڕێت بە دوای کەسێکی دەست پاکدا، مانگی بە (٣٥) هەزار، هەر بۆ بەیانی چوومە سەر کارەکە و بە شەویش بۆ ئەوەی بەدیار حەماڵ و کرێکارەکانەوە خەوم لێنەکەوێت وەکو کرێکار بارم لەگەڵدا دەگرتن، شەوی بە سێ هەزار تمەن، (٣٥) هەزار هەقی مانگانەکەم و (٦٠) هەزاریش هەقی کرێکاریەکەم، ئیتر مانگی (٩٥) هەزار تمەنم دەست دەکەوت.

# خێر و چاکە لەگەڵ منداڵ

لە کتێبی (ئەسرینەکانی سەدەی بیستەم)ەوە، پیاوەکە هیچی نەبوو، چووە بازاڕ، تەنها یەك دیناری ئاسنی پێبوو، یەك دەست سڵقی پێ کڕی، لە ڕێگە ژن و منداڵێکی بینی، منداڵەکە هەر دەگریا، پیاوەکە وتی: چی دەوێت خوشکێ؟ ووتی: هیچ کاکە تۆ بڕۆ، دەڵێ منیش ڕێم لەبەر نەچوو هەتا زۆرم لێکرد، بۆم دەرکەوت داوای سڵق دەکات، دایکیشی پارەی پێ نییە، منیش وتم: خوایە لەبەر خاتری تۆ ئەو دەسکە سڵقەی دەدەمێ، بەڵێ سڵقەکەم دایە دەستی منداڵەکە و ڕۆیشتم، لە ماڵەوە هەرچی هەبوو شتێکی سادە خواردمان و قسەم نەکرد، هەرچی وتیان: منداڵ لە بەیانییەوە چاوەڕێی شتن بۆیان بکڕی، قسەم نەکرد، ـ شەو خەونم بینی ـ قیامەت بوو، تەرازووی خراپەکانم قورس بوو، چاکەکانم سووك بوون، زۆر دەترسام، لەوەدا بوو ڕەوانەی ناو دۆزەخم بکەن، بەڵام بینم لە ئاسمانەوە گەڵا سڵقەکان یەك یەك دەهاتنە خوارەوە دەکەوتنە سەر تاکی تەرازووی چاکەکانم، هەتا قورسیان کرد و ڕزگارم بوو.

لە پێگەیەکی ئینتەرنێتەوە خوێندمانەوە، لە میسر بەرنامەیەکی کۆکردنەوەی کۆمەکی بۆ (نەخۆش و هەژار و لێقەوماو)، کۆمەکیی کۆدەکردەوە بۆ نەخۆشییەکی ترسناك، کەسێك بەشداریی کرد، وتی: ئەوە پێنج جونەیهم نارد، ئێمە لە ماڵەوە هەر خۆم و دایکم بە یەکەوەین، لەو پێنج جونەیهەش زیاترمان نییە، دواتر ئێمە بە دیار بەرنامەکەوە دانیشتووین، هەرکەس کۆمەکی دەنارد دەیووت: نیوەی بۆ نەخۆشەکە و نیوەی بۆ ئەو کوڕ و دایکە خێرەوەمەندەی لەو پێنج جونەیهە زیاتریان نییە، دەڵێ پیاوێك وتی: ئەوە هەزار دۆلارم نارد، نیوەی بۆ ئەوان و نیوەی بۆ نەخۆشەکە، دواتر کوڕەکە لە کۆتایی بەرنامەکەدا پەیوەندی کرد وتی: ماوەیەکی زۆر بوو دایکم نەخۆش بوو، پارەمان نەبوو هیچ چاریشمان نەبوو، ئەم شەو لەو بەرنامەیەدا دایکم کە نەخۆشەکەی بینی وتی: کوڕم نەخۆش حاڵی نەخۆش دەزانێت، تو خوا ئەو پێنج جونەیهەی هەمانە بینێرە بۆ ئەو نەخۆشە، منیش لەسەر قسەی دایکم بۆم ناردن، ئێستا بە ئەندازەی نەخۆشەکە کۆمەکییمان بۆ کۆکراوەتەوە.

# منداڵی خێرەوەمەند

منداڵێکی هەتیو لە گوندی (هەڵەدن) کە هەتیوو بوو، ڕۆژانە تەنها دووسەدوپەنجا دیناری وەردەگرت، لە ئاهەنگی یادی لە دایکبوونی پێغەمبەردا (ﷺ) کە خەڵکی گوندەکە سازیان کردبوو، خۆشم بەشدار بووم و لەوێ بووم (نووسەر)، (٢٥٠) دینارەکەی هێنابوو بۆ مامۆستا (مەلا)ی گوندەکە، مامۆستاش بە سەیرێکەوە تێی ڕادەمێنێ، زەردەخەنەیەك دەیگرێت، منداڵەکە هەڵوێستەیەك دەکات و تێڕامانی مامۆستای پێ سەیر دەبێت، بۆیە یەکسەر دەڵێ: مامۆستا ئەگەر کەمە (٢٥٠)کەی بەیانیشت بۆ دێنم، تۆ ئەمەم لێوەرگرە با لەم یادە پیرۆزەدا بەشدار بم.

گوڵەبەڕۆژە فرۆشەکەی هەولێر کە ماڵ و منداڵی بەو سینییە گوڵەبەڕۆژە بەخێو کردووە، بەڵام ساڵی (٢٠٠٧) لە (١٢) ڕەبیعولئەوەل، سینییە گوڵەبەڕۆژەکەی هەموو کردووە بەخێر، وتویەتی: دەبێ بیسەلمێنم پێغەمبەرم خۆش دەوێت.

# منداڵی دزراو

سەعید قامیشی (ئەو منداڵە بوو بە منداڵی دزیبوویان)، دوای چل ساڵ لە بەغداوە گەڕایەوە و باوکی نەما بوو، بەڵام دایکی ناسیەوە، بە سوتاوییەکی منداڵی کە بوو بووە نیشانە بە لەشیەوە - پۆلیسێکی وەجاخ کوێری دەوڵەمەندی عەرەب بردبووی — کە گەڕایەوە کوردیی نەدەزانی، بەڵام پۆلیسەکە ناونیشانی سلێمانی و شارباژێر و گوندی قامیشی پێدابوو، هەموو موڵك و ماڵی خۆشی لەسەر تاپۆ کردبوو.

# بێوەفایی کوڕ

**لە بەرنامەیەکدا گوێم لێبوو مامۆستایەك باسی کرد:**

ئەو دایکەی کوڕەکەی بە خەنجەر کوشتی و پێش گیان دەرچوونی دایکی پەشیمان بووەوە و لەبەرچاوی دایکی دەستی بەرز کردەوە ویستی خەنجەرەکە بکات بەسەر دڵی خۆیدا، بەڵام دایکی لە گیانەڵڵادا دەستی بەرز کردەوە و وتی: خەنجەرێکت لە دڵم دا، توخوا مەیکە بە دوو خەنجەر، کوڕەکەش بە گوێی کرد، ئیتر دایکی بە ڕووی خۆش و زەردەخەنەوە سەرینایەوە، کاتێ ئەمین بوو کوڕەکەی ئەم جارە لە قسەی دەرنەچوو، شوکر بۆ خوا خۆی نەکوشت (١).

# بێمتمانەیی

دەگێڕنەوە پیاوێك بەسەر ئەسپێکەوە دەبێت، لە ڕێگەیەکی دوور و چۆڵدا پیاوێکی زۆر شەکەت وپەککەوتەی بینی، لە دوای خۆیەوە سواری کرد، دوای ماوەیەك کابرا حەسایەوە، خەنجەرەکەی دەرهێنا و بە کابرای خاوەن ئەسپی وت: دابەزە هەتا نەمکوشتووی، زینی ئەسپەکەم بەرە دەست، دوای پاڕانەوە و تکا و ڕجا دابەزی، ئەویش زینی ئەسپەکەی گرت، بەڵام کابرا بە چەتەکەی وت: مەڕۆ ئەم قسەم لێوەرگرە، (توخوا ئەم بەسەرهاتە بۆ کەس باس مەکە، با خەڵکی لە پیاوەتی و خێرکردن خەمساردیی نەکەن و واز لە خێرکردن نەهێنن).

# بە حەوت دینار ژن و منداڵەکەی ڕزگار کرد

بەسەرهاتی حاجی صالح گەلاڵەیی ـ کە ژنەکە خەریك بوو تەڵاق بدرێت، بە حەوت دینارەکەی خۆی ئافرەتەکە و منداڵەکانی ڕزگار کرد ـ ئافرەتەکە لە تەڵاقدان، منداڵەکانیش لە ئاوارەیی و بێ دایکی.

حاجی ساڵح گەلاڵەیی دانیشتووی گەڕەکی مەجیدبەگ لە سلێمانی کە ماوەی (١٩) ساڵە لە مزگەوت هاوڕێین و زیاتر لە (١١) ساڵیشە دراوسێین. بۆی گێڕامەوە کە لە سەرەتای پەنجاکاندا لە ناوچەی پێنجوێن پۆلیس بووم، شەوێك لە یەکێك لە گوندەکانی ئەو دەڤەرە ماینەوە، ئێوارە بۆ نانخواردن دابەشیان کردین بە سەرماڵەکاندا، من بە تەنیا بەر ماڵێك کەوتم، کە چوومە ژوورەوە تەنها یەك ئافرەتم بینی خەریکی چێشت لێنان بوو، سەلامم لێکرد و زۆر بە گەرمیی فەرمووی کردم، کە دانیشتم و وردبوومەوە، بۆم دەرکەوت ئەو ماڵە تەنها ئەو ئافرەتەی تێدایە، بۆیە هەستام بڕۆم، ئافرەتەکە وتی: کاکە بۆ هەستای؟ بۆ کوێ دەچی؟ وتم: وەڵلا بە تەمام بڕۆم. وتی بۆ؟ وتم: چونکە ئەم ماڵە هەر تۆی لێی و دروست نییە من لێرە بمێنمەوە.

وتی: دانیشە نابینی ئەو مەنجەڵە گەورەم خستۆتە سەر ئاگر، ئێستا قەرەباڵغ دەبێت، ئیشمان بە دەستەوەیە. وتم: ئیشی چی؟ وتی: بە تەمان تەڵاق بە تەڵاق بکەن. وتم: بۆ خوشکم؟ وتی: من ژنبەژنم پێکراوە لەگەڵ ئافرەتێك، من منداڵم نابێت، دەیانەوێ تەڵاقم بدەن، بە زۆریش ژن بە براکەم تەڵاق ئەدەن و سێ منداڵیشی هەیە.

زۆری پێنەچوو چەند پیاوێك مامۆستایەکی ئایینیان پێش خۆیان خستبوو، لەگەڵ ژنێك و سێ منداڵدا خۆیان کرد بە ژووردا و قەرەباڵغ بوو، خاوەن ماڵیش فەرمووی کردن و بەخێرمان هێنان، نوێژمان کرد و دەستمان کرد بە نانخواردن، دوای نانخواردن مامۆستا دەستی کرد بە قسەکردن وتی: ئێوە کە بە گوێی کەس ناکەن و هەر سوورن لەسەر قسەی خۆتان، با زوو جێبەجێی بکەین، چونکە درەنگە و ئێمە دەبێ بگەڕێینەوە، قسەیان دامەزراند، مێردی ئافرەتە نەزۆکەکە سوور بوو لەسەر تەڵاقدانی هاوسەرەکەی و

بەرامبەرەکەشی لەو چێتر بوو، دەیوت: وەڵڵا تۆ تەڵاقی بدەی، منیش تەڵاقی ئەدەم، ئەویش دەیوت: بە خۆشی خۆت نییە دەبێ تۆش تەڵاقی بدەی، منیش گوێم ڕاداشتبوو، لە بابەتەکە تێگەیشتم، بەهەرحاڵ هاتنە سەر نووسینی تەڵاقنامە، وتم: یارمەتیم دەدەن منیش دوو قسە بکەم، وتیان: فەرموو، ڕووم کردە باوکی منداڵەکان، وتم: کاکە تۆ هەر تەڵاقی ئەدەی؟ وتی: بەڵێ، وتم: ئەی خۆت بە پیاو نازانی؟ وتی: بەرەوەڵڵا، وتم: دەی پیاو دەبێ سوڵح بکات، تۆ سوڵح ناکەیت؟ وتی: بۆ نایکەم، منیش چەند ساڵ بوو لە مووچەی پۆلیسیەکەم حەوت دینارم پاشەکەوت کردبوو، لە دەمی خۆم و ماڵ و منداڵم گرتبۆوە، لەوە زیاترم شك نەدەبرد، حەوت دیناریش زۆر زۆر بوو بۆ ئەو سەردەمە و خانووی پێ دەکڕا ـ ڕووم کردە کابرا و وتم: بە چەند سوڵح دەکەی؟ وتی: بە دە دینار، ـ دە دیناری پەنجاکان پارەیەکی زۆر بوو ـ، وتم: ئەی خاتری خوا؟ وتی با نۆ دینار بێت، وتم: خاتری مامۆستا و جەماعەت، وتی: باشە، با هەشت دینار بێت، بەڵام لەوە کەمتر ڕازی نابم، برای ئافرەتەکە وتی: بە خوا لە مانگایەك و گوێدرێژێك زیاتر شك نابەم کە هەر بەو دوانەش جووت دەکەم، ئیتر تۆ سوڵحی چیم بۆ دەکەی بە پارە؟ منیش هەر کە سەیری منداڵەکانم دەکرد نانیان نەخوارد و داوێنی دایکیان بەرەڵڵا نەدەکرد، وەخت بوو سەریان هەڵکەندرێت بە دەم هەنسکدانەوە، دوو گەورەکەیان بە دەم گریان و فرمێسك ڕشتنەوە زوو زوو دەیانوت: توخوا دایکە بە جێمانمەهێڵە، ئیتر من لە تاوی ئەو سێ منداڵە جەرگم ژانی دەکرد، گریان و غوربەت بەری قورگی گرتبووم، قسەم باش بۆ نەدەکرا، بەهەرحاڵ وتم: کاکە بۆ خاتری ئەم برایەی ئەو ئافرەتەش ناگریت؟ وتی: چارم نییە لەبەر تەکلیف و تکای تۆ، با دینارێکیشی خاتری تۆ بێت، بە خوا لەوە کەمتر ڕازی نابم وقسەی تری لێمەکە، حاجی ساڵح دەڵێت: بە ئاواتی خۆم گەیشتم، یەکسەر حەوت دینارەکەی سەرمایەی ژیانم بوو خستمە بەردەستی کابرا و وتم: پیاو ئەو پیاوەیە پەشیمان نەبێتەوە، وتی: پیاو قسە دەکات، وەریگرت، سوڵح کراو ئافرەتەکەش لە خۆشییدا باوەشی کرد بە منداڵەکانیدا و منداڵ گەشانەوە و باوەشیان بە دایکیاندا کرد، ئینجا داوای نانمان کرد بۆ منداڵەکان، منداڵ نانیان خوارد و دڵیان خۆش بوو، چونکە ئێوارە لە تاوی دایکیان نانیان بۆ نەخورا، وەکو گوڵ گەشانەوە، منیش لەبەر

خوا ئەو کارەم کرد، هیچ مەبەستێکی دونیاییم نەبوو، تەنانەت پرسیاری ناوی ژن و پیاوەکەشم نەکرد، جارێکی تریش بەو ناوەوە نەچوومە ئەو گوندە.

جارێك ئافرەتەکەم بینی، قابلەمەیەك ماستی پێبوو، وتی: کاك صاڵح من فلان ئافرەتم کە ڕزگارت کردم و بوویە فریشتەی منداڵەکانم، ئەم قابلەمە ماستەم بۆ هێناوی، بە خوا هەرگیز لە بیرم ناچێتەوە، خودا پاداشتت بداتەوە وەکو دڵی ئەو منداڵانەت خۆشکردم، حاجی ساڵح وتی: بە ئافرەتەکەم وت، برۆ خوشکم بە خوا دەبێ قابلەمە ماستەکەت بەریتەوە وجارێکی تر ڕازی نیم بێی بۆ ماڵمان و دیارییم بۆ بێنی، من بۆ خوام کردوە، خوا حافیزت بێت، قابلەمە ماستەکەم پێدا ناردەوە، خوا لێم وەرگرێت.

# پێرستی بابەتەکان

فرمێسک ڕشتن لە پێناوی خوادا لە خوێنڕشتن
کاریگەرترە، ئەو چاوەی فرمێسکی لەبەر خوا داباراند
بێت دووکەڵی دۆزەخی تێناچێت، دەی بەڕێزیشت
بەشدارییمان بکە بە ڕشتنی چەند دانە گەوهەرێک لە
فرمێسکەکانی چاوت لە خوێندنەوەی ئەم
گەوهەرنامەدا و هاوخەمیی و هاوسۆزیی خۆت دەرببڕە
بۆ پاڵەوانانی ئەم چیرۆکستان



لە بەڕیوبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان
ژمارەی (2 - 18) ی ساڵی 2010 ی پێ دراوە